م. شکریە شێخانی



# باڵاپۆشی

تاج و ناسنامەیەکی پڕ لە شکۆمەندیە
بۆ ئافرەتانی بڕوادار

# بالاپۆشی

نووسینی: م. شوکریە شێخانی

پێداچوونەوەی: هەرمان دەروێش

نەخشەسازی بەرگ و ناوەوە: زەردەشت کاوانی

## کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی

بەڕێوەبەری گشتی: موحەممەد خضر ئەحمەد ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤

بەڕێوەبەری هونەری: موستەفا موحەممەد کوردی ٠٧٥٠٩٩٩٨١٨٢

فەیسبووک: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana

ئنیستگرام: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana

لقی یەکەم: بەرانبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

لقی دووەم: چوارڕیانی شێخ مەحمود - بەرانبەر مزگەوتی مەحمود عەلاف

ئیمێل: mdmaktaba@gmail.com

چاپی دووەم: ١٤٤٥ک - ٢٠٢٤ز

پێوانە: ١٤ * ٢١

تیراژ: ١٠٠٠

لاپەڕە: ٩٦

نرخ: ٣٠٠٠

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان

ژمارەی سپاردنی (٩٩٣) ساڵی (٢٠٢٢)ی پێدراوە.

تاج و ناسنامەیەکی پڕ لە شکۆمەندییە

بـۆ ئـافرەتـانی بـــڕوادار

نووسینی

م. شوکریــە شێخــانــی

# پێشکەشە بە

سەرجەم ئەو ئافرەتە بڕوادارە ڕاستەقینانەی کە:

- کاتێك گوێبیستی فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ دەبن، دەفەرموون ئەی پەروەردگارا! گوێبیست و ملکەچ بووین بۆ فەرمانەکانتان، گوناهەکانی ڕابردوومان بپۆشە.

- گرنگی دەدەن بە ناوەڕۆك و بەردەوام هەوڵی پاککردنەوەی دڵ و دەروونیان دەدەن، لە ڕواڵەت و ناسنامە و هەڵسوکەوت و خووڕەوشتیان، وەك ئافرەتێکی بڕواداری پێشەنگ دەردەکەون.

- کات بە سەرمایە و سامانی ژیانیان دەزانن و، کات تەرخان دەکەن بۆ گرنگدان بە توانا و لێهاتووییەکانیان، ئامادە نین سەرمایەی ژیانیان لە کاری بێسوود بە فیڕۆ بدەن.

- خۆی زەوییەکی پاك و چاك و بە پیت و بەرەکەتە، نەوەیەکی چاکەخواز بەرهەم دەهێنێت و پێشکەش بە کۆمەڵگەی دەکات.

## پێشەکی

کاتێك سەرنج دەدەم لە کۆمەڵگە دیندار و پاکەکەی خۆمان، زۆرێك لە ئافرەتان خاوەن بڕوا و خووڕەوشت و ئاکاری جوانن، لە ڕووی خواپەرستییشەوە لە نوێژ و ڕۆژوو کەمتەرخەم نین. زۆرێك لەوانە هەڵگری بڕوانامەی بەرزن، بەڵام بە داخەوە لە ڕواڵەتدا بە شێوەی نیمچەڕووت دەردەکەون.

جا هەندێکیان دەڵێن: ئێمە لە نێوەڕۆکدا پاکین و ڕواڵەت مەرج نییە!

هەندێکی دیکەیان دەڵێن: پەروەردگار بۆ بەندەکانی بەبەزەییە و ئێمەش چاکەمان زۆرە، دەی چاکەکانمان خراپەکانمام دەسڕنەوە، ئەی ئەوە نییە پەروەردگارمان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴿١١٤﴾﴾هود

خۆ هەشیانە دەڵێن: چی بکەین هێشتا قەناعەتمان بە بالاپۆشی بۆ دروست نەبووە! ئێمە لە زۆرێك لە ئافرەتە بالاپۆشەکان چاکترین و... هتد.

هەموو ئەمانە هانیان دام بیر لە نووسینی ئەم نامیلکەیە بکەمەوە و باس لە پێناسە و جۆر و مەرج و حیکمەت و فەلسەفە و فەرمان و سزا و پاداشت و سوود و زیانەکانی بالاپۆشی لە ڕووی

شەرعی و زانستییەوە، بۆ خوشکانی ئازیزم ڕوون بکەمەوە و، ئەو پەیامەیان پێ بگەیەنم کە:

بالاپۆشی بڕوایە، ملکەچییە، خواپەرستییە، لەخواترسییە، تاجە، پاکییە، سترە، شەرم و شکۆیە، ناسنامەیە، غیرەتە... ئافرەتی بالاپۆش بە خواپەرست و ڕۆژووگر (الصّوامة والقوّامة) هەژمار دەکرێ، کە پاداشتەکەی بریتییە لە بەهەشتی نەبڕاوە. بالانەپۆشی بریتییە لە سەرکەشی و بێفەرمانیی خوا و پێغەمبەرەکەی (دروودی خوای لێ بێ)؛ بە درێژاییی کات و ساتەکان سزاکەی بریتیە لە دۆزەخ. لە کۆتاییی نامیلکەکەدا چەند ڕووداوێکی ڕاستەقینە باس کراون، لەگەڵ چەند موژدەیەکی خۆش لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێ).

بە هیوام ئەم نامیلکەیە بگاتە دەست سەرجەم ئەو خوشکانەی کە پێویستیان بە ڕێنماییکردنە بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی بالاپۆشی.

لێرەشەوە زۆر سوپاسی برای بەڕێزم کاك «سیروان کاکە ئەحمد» دەکەم کە ئەرکی پێداچوونەوە و دیزاینی گرتە ئەستۆی خۆی. خوای گەورە ئەم کارەشی بخاتەی تەرازووی کردەوە چاکەکانی دیکەی.

بە هیوای دوعای خێری گشت لایەکین.

م. شوکریە شێخانی

# بـالاپـۆشی (الحجاب)

**پێناسەی (الحِجَابُ):**

لە ئەسڵی زماندا: (السَّتْرُ والْمَنْعُ) واتە: پارێزگاریکردن و ڕێگاگرتن؛ داپۆشین.

لە زاراوەی شەرعدا: بریتییە لە پاراستنی گشت ئەندامەکانی جەستە لە دەرخستنی جوانییەکانی، بەرانبەر بە ڕەگەزەکەی تر، ئەم پاراستنەش بە جل و بەرگی شەرعی دەکرێت.

**حیکمەت و فەلسەفەی بالاپۆشی:**

١- ناســـنامە و تـــاج و پاکیی ئافرەتی بڕوادارە، بەڵکوو نیشانەی بڕواداریەتیی ئافرەتی مسوڵمانە.

٢- دەربڕینێکی ڕاستەقینەیە کە لە ناخی ئافرەتی بڕوادردایە، بڕوای بە لێزانی و کارجوانی و زانایی و دانایی و فەلسەفەی فەرمانی دروستکار و پەروەردگاری خۆی هەیە. کاتێك ئەو جۆرە جل و بەرگانە دەپۆشێت، هەست بە ئارامیی دڵ و پارێزراویی جەستە و شکۆی خۆی دەکات. بەڵێ، هەست دەکات ئەو مرۆڤێکی

ڕێزلێگیراوە لە لایەن ئەهلی ئاسمان و زەوی؛ دەزانێت ژیان تەنیا بریتی نییە لە لایەنە ماددی و شەهوانییەکەی، بەڵکوو بە چاوی ژیری ناوەڕۆکی شتەکان دەبینێت.

٣- ئافرەتی بڕوادار کاتێك کە حیجاب دەپۆشێت، بە تەواوی هەست بە بەرپرسیارەتی دەکات و دەزانێ باڵاپۆشی مانایەکی گشتگیری هەیە؛ سەرجـــەم ڕەفتار و کردار و گوفـــتار و هەڵسوکەوتێکی دەگرێتەوە.

٤- باڵاپۆشی جۆرێك لە کەسایەتی و هەیبەت و ئازادی بە ئافرەتی باوەڕدار دەبەخشێت. ئەو جوانی و ناسکییەی کە پەروەردگار پێی بەخشیوە، هەرگیز ڕێگا نادات وەك کەلوپەلێکی بێ‌نرخ، هەر کەسێك حەز بکات لەزەت و تام و چێژ لە سەیرکردنی وەربگرێت.

٥- لەپێناو لێکەوتنەوەی نەوەیەکی پاك و بێگەرد و پێوەست بە ئایین و داب و نەریت، لە کاتێکدا کۆرپە کە چاوی دەکاتەوە، ژیان و دەوروبەری خۆی دەبینێت، هەڵبەتە یەکەم کەس دایك و باوکێکی پاك و پابەند بە ئایینەوە دەبینێت و، پێشنەگی و بەرەکەتی ئەوان ڕاستەوخۆ کاریگەریی لەسەر جگەرگۆشە دەبینێت.

٦- هەڵبەتە شەرع و بەرنامەی پەروەردگاری زانا و دانا و کاربەجێ، هاوسەنگ و یەکانگرە لەگەڵ عەقڵی ساغڵەم و فیترەتی ڕاست. بێگومان یاسا و ڕێسایەکانی پەروەردگار، گشتی دادگەری و کاربەجێیی و کارجوانی و بەزەیی زۆری تێدایە بۆ بەندەکانی.

٧- لەپێناو پاراستنی مرۆڤ و نەکەوتنە نێو لێواری گوناهـ و تاوان و لادان و بەدڕەوشتی و لێککەوتەی خراپ و توڕەبوونی پەروەردگار.

٨- بالاپۆشی ڕێزێکی پەروەردگارە بۆ ئافرەتی بڕوادار. بە هۆی بالاپۆشییەوە ئافرەتی بڕوادار وەك فریشتە و (الحور العین)ـی لێ دێ لە ڕووی سیفەتەوە، چونکە بالاپۆشی ڕێگرە لە سەیرکردن و چێژوەرگرتن لە جوانی و قەشەنگیی ئافرەت لە لایەن ڕەگەزی بەرانبەرەوە، تەنیا بۆ هاوسەرەکەی خۆی نەبێت. پەروەردگار بەم شێوازە باسی سیفاتی حۆرییەکانی بەهەشت دەکات و دەفەرمووێ: ﴿فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٌ قَبۡلَهُمۡ وَلَا جَآنٌّ ۝٥٦﴾ الرحمن، واتە: لەو بەهەشتەدا حۆری تێدایە کە تەنیا تەماشای پیاوەکانیان دەکەن و، پێش هاوسەرەکانیان دەستی کەسیان بەر نەکەوتووە؛ نە ئادەمیزاد و نە جن.

## جۆرەکانی بالاپۆشی

**یەکەم: ڕواڵەتی (الظاهري):**

بریتیە لەو پۆشتەییەی کە پەروەردگار لە قورئانی پیرۆز فەرمانی بە کچان و ئافرەتانی بڕوادار کردووە لە ئاست پیاوانی نامەحرەم. بە شێوەیەکی ڕاشکاوانە لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کراوە و زانایانی شەرعناس ئاماژەیان بە مەرج و شێواز و جۆرەکانی کردووە. بەم زاراوانە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە:

**أ/ (النقاب):** بریتییە لە داپۆشینی هەموو جەستە لەگەڵ دەست و ڕوخسار.

هەندێك لە شەرعناسەکان ئەم جۆرە بالاپۆشییە بە فەرز و واجب دەزانن، وەک ئیبن تەیمیە و ئیبن عوسەیمین.

**ب/ بالاپۆشیی ئاسایی:** بریتییە لە داپۆشینی گشت جەستە، جگە لە دەست و ڕوخسار.

دەرخستنی دەست و ڕووخسار بە شێوەیەکی سروشتی لە لایەن هەندێك لە شەرعناسەکان ڕێگەپێدراوە، وەك: پێشەوایان لە زانایانی

سەلەف (أبو حنيفة و مالك)،[1] هەروەتر لە زانایانی سەردەم (محمد ناصر الدين الألباني و يوسف القرضاوي)، بە بەڵگەی ئایەتی: ﴿ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ﴿٣١﴾ ﴾النور، واتە: داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناهـ و جوانیی خۆیان دەرنەخەن، جگە لەوەی دیارە، (وەك دەست و ڕوخسار)، با سەرپۆشەكانیان بدەن بەسەر سینە و ملیاندا...

ئەم زانایانە داپۆشینی دەست و ڕوخساریان بە سوننەت و موستەحەب داناوە.

ج/ (الخمـــار): هەروەك لە سوورەتی (النور) ئاماژەی پێ دراوە: ﴿ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ﴿٣١﴾ ﴾النور.

بریتییە لە واجببوونی داپۆشینی سەر و قژ و سینگ بە پارچە قوماشێكی گونجاو. كە وا بێت، جیاوازی لە نێوان (الحجاب و الخمار) ئەوەیە كە حیجاب هەموو جەستە دەگرێتەوە، بەڵام (خمار) تەنیا سەر و قژ و سینگ دادەپۆشێ.

د/ (الجلـباب): بریتییە لە دوو پارچە قوماش كە سەرجەم جەستە و ڕوخساری ئافرەت دادەپۆشێ. نیوەی وەك تەنوورە یان عەزیە دەپۆشرێت، بەشی دووەمی لە سەرەوە تاكوو چۆك دادەپۆشێت، یان وەك شێوەی عەبای سعوودی دەپۆشرێت.

---

(١) فتاوى موقع الألوكة، المؤلف: مجموعة من العلماء.

## دووەم: ناوەکی (الباطني):

بریتییە لەو پۆشتەییەی کە پەروەردگاری باڵادەست فەرمانی بە ئافرەتان و کچان و پیاوان و گەنجانی بڕوادار کردووە، لە خۆپاراستن و خۆدوورخستنەوە لە سەرجەم هەڵسوکەوتێکی نەشیاو، بەڵکوو ئەنجامدانی سەرجەم ئاکار و ڕەوشت و هەڵسوکەوتێکی بەرزو جوان و شیاو. باڵاپۆشیی ڕواڵەتی دەبێتە تەواوکەری ئەم باڵاپۆشییە. ئەم باڵاپۆشییە سەرجەم ڕەوشت و ئاکا رو هەڵسوکەوت و مامەڵەیێکی بەرز و جوان دەگرێتەوە. ئەوەتا پەروەردگاری باڵادەست لە سوورەتی (النور)ـدا بە شێوەیەکی زۆر ڕاشکاوانە فەرمانی پێ کردووە، فەرموویەتی: ﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ...(٣٠) ﴾، واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: بە پیاوانی ئیماندار چاوی خۆیان (لە سەیرکردنی ئافرەتی نامەحرەم) دابخەن و بپارێزن، هەروەها عەورەتیان (لە داوێنپیسیی) بپارێزن.

هەروەها بە ئافرەتانی بڕواداریش دەفەرمووێ: ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا(٣١) ﴾.

واتە: بە ئافرەتانی بڕوادار بڵێ: چاویان بپارێزن (لە تەماشاکردنی نامەحرەم)، داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناهـ و، جوانیی خۆیان دەرنەخەن، جگە لەوەی کە دەردەکەوێ و دیارە، وەك (دەستەکان و دەم و چاو).

## مەرجەکانی بالاپۆشی

کۆمەڵێك مەرج هەن کە لە کۆی وتەی شەرعناسان وەرگیراون، بریتین لە:

١- تەسك نەبێ بە شێوەیەك بەرز و نزمیی جەستەی ئافرەتی تێدا دەربکەوێ، جگە لە عەقڵ و سروشت و فیترەتی مرۆڤی ژیر و عاقڵ، کە لای پەسەند و دروست نییە ئافرەت بە جلی تەسك و تروسك دەربکەوێت کە وەسفی ئەندامەکانی بکات، چونکە ئامانج و مەبەست و حیکمەت و فەلسەفەی بالاپۆشی بریتییە لە جل و بەرگێك، داپۆشین و سترێکی ڕاستەقینەی هەبێت، دیارە لەبەرکردنی ئەم جۆرە جلانەش، پێچەوانەی ئامانج و مەبەستی بالاپۆشییە. بەڵگەی شەرعیش بۆ قسەکانمان بریتییە لەم فەرموودەیەی ئازیز و سەروەرمان (دروود و سلاوی خوای گەورەی لێ بێت): عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْد ، قَالَ : كَسَانِي رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ قُبْطِيَّةً[١] كَثِيفَةً كَانَتْ مِمَّا أَهْدَى دِحْيَةُ الْكَلْبِيُّ ، فَكَسَوْتُهَا امْرَأَتِي ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ : « مَا لَكَ لَمْ تَلْبَس الْقُبْطِيَّةَ " . قَالَ: قُلْتُ : يَا رَسُولَ اللَّهِ كَسَوْتُهَا امْرَأَتِي ، قَالَ : فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ

---

(١) قبطية: جۆرە پۆشاکێکی نەرم و تەنکە بە جۆرێك قەبارەی لاشە دەردەخات و شێوەی جەستە پێیەوە دەردەکەوێت.

: « مُرْهَا فَلْتَجْعَلْ تَحْتَهَا غِلاَلَةً إِنِّي أَخَافُ أَنْ تَصِفَ حَجْمَ عِظَامِهَا»[١]
واتە: ئوسامەی کوڕی زەید دەفەرمووێ: پێغەمبەری خوا ( درووود و سڵاوی خوای گەورەی لێ بێت) پۆشاکێکی پێ خەڵات کردم کە خۆیشی بە دیاری لە لایەن (دحیە الكلبیـــیەوە وەری گرتبوو. منیش کردمەوە بە دیاری بۆ خێزانەکەم، پێغەمبەری خوا (درووود و سڵاوی خوای گەورەی لێ بێت) فەرمووی: بۆچی پۆشاکە قبطیەکەت لەبەر نەکردووە؟! منیش گوتم: دام بە خێزامەکەم. ئیتر پێمی فەرموو: فەرمان بە خێزانەکەت بکە کە ژێرکراسێك لە ژێرەوە بپۆشێت، چونکە دەترسم شێوەی جەستەی دەربخات.

٢- تەنك نەبێت، بە شێوەیەك پێست و مووی تێدا دەرنەکەوێت. بەڵگەشیان ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوایە (درووود و سڵاوی خوای گەورەی لێ بێت): (صِنْفان من أَهْلِ النَّار لَمْ أَرَهُما، قَوْمٌ معهُمْ سِياطٌ كَأَذْناب البَقَر يَضْربُونَ بها النَّاسَ و نَساءٌ كَاسياتٌ عارياتٌ).[٢]
واتە: دوو کۆمەڵە لە خەڵکی دۆزەخ هەن کە هاوشێوەیانم نەبینیوە، کۆمەڵێکیان قامچیان بە دەستەوەیە وەك کلکی مانگایە کە پێی لە

---

(١) الراوي: أسامة بن زيد | المحدث : الرباعي | المصدر : فتح الغفار الصفحة أو الرقم : ١/٢٦١ | خلاصة حكم المحدث : [له شواهد] في إسناد [أحدها] ابن لَهِيْعَةَ [إلا أنه] قد تابعه يحيى بن أيوب المصري، وقد احتج به مسلم واستشهد به البخاري.

(٢) الراوي : أبو هريرة | المحدث: مسلم | المصدر: صحيح مسلم | الصفحة أو الرقم: ٢١٢٨ | خلاصة حكم المحدث : صحيح

خەڵکی دەدەن. کۆمەڵەکەی تریان ئافرەتانێکی نیمچەڕووتن.

مەبەست لە (کاسیات و عاریات) ئەوەیە کە بە ڕواڵەت پۆشتەن، بەڵام لە ڕاستیدا ڕووتن وەك ئەوەی کە بەرگێکی تەنك بپۆشن کە ڕەنگی جەستەیان دەربخات.[١]

٣- سەرنجڕاکێش نەبێ، سەرنجی گەنجان و پیاوان بۆ لای خۆی ڕابکێشێت.هەڵبەتە حیکمەت و فەلسەفەی بالاپۆشی بریتییە لە داپۆشینی عەورەت و داپۆشینی جوانیی ئافرەت، بۆیە ناشێت و ناگونجێت کە ئافرەتانی بالاپۆش شتێك بپۆشن کە ڕازاوە بێت و ڕەنگێکی سەرنجڕاکێشی هەبێت، بە شێوازێك سەرنجی پیاوان بەرەو لای خۆی ڕابکێشێت. بەڵگەشمان بریتییە لەو فەرمایشتەی خوای گەورە بۆ پێغەمبەرەکەی (دروود و سڵاوی خوای گەورەی لێ بێت) کە دەفەرمووێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٩﴾ ﴾ الأحزاب: ٥٩

واتە: ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) بە هاوسەرانت و کچەکانت و ئافرەتانی ئیماندار بڵێ: کە بە پۆشاکی پۆشتە خۆیان داپۆشن، ئەوە لەبارترین شتە کە پێی بناسرێن، تا ئازار نەدرێن و (تووشی گیروگرفت نەبن)، هەمیشە و بەردەوام خوا لێخۆشبوو و

---

(١) بڕوانە: الزواجر عن اقتراف الکبائر- ابن الحجر الهیثمي (٣٠١/١)

میهرەبانە (لە کەموکووڕیی ڕابردووتان خۆش دەبێت)[1].

٤- پێویستە هەموو جەستە داپۆشێت جگە لە دەست و دەم و چاو، بەڵگەشمان ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیە کە فەرموویەتی ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾ النور: ٣١

ئیبن کەسیر لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێت: (لە بەردەم پیاوانی بێگانە و نامەحرەم هیچ شتێك لە جوانیی خۆتان دەرمەخەن). [2]

٥- جل و بەرگێکی ڕێك وپێك و شیاو بە ئافرەتان بێ، بە جل و بەرگی پیاوان نەچێت. دیارە خوای باڵادەست و پەیامبەرەکەی (دروود و سڵاوی خوای گەورەی لێ بێت)، نەفرەتیان لە پیاوانێك کردووە کە خۆیان بە ئافرەتان دەچوێنن و جل و بەرگی ئافرەتان لەبەر دەکەن، هەروەها نەفرەتیان لەو ئافرەتانە کردووە کە خۆیان بە پیاوان دەچوێنن و جل و بەرگی پیاوان لەبەر دەکەن، هەروەك پێغەمبەری خوا (دروود و سڵاوی خوای گەورەی لێ بێت) دەفەرموێت:

(لَعَنَ رَسولُ اللَّه صَلَّى اللهُ عليهوسلَّمَ المُتَشَبِّهينَ مِنَ الرِّجَالِ بالنِّسَاءِ، والمُتَشَبِّهَاتِ مِنَ النِّسَاءِ بالرِّجَالِ)[3]

---

(١) تەفسیری ئاسان

(٢) تفسير ابن كثير- مجلد ٤ – ص٤٥

(٣) الراوي : عبدالله بن عباس ا المحدث : البخاري ا المصدر : صحيح البخاري الصفحة أو الرقم : ٥٨٨٥ ا أحاديث مشابهة ا خلاصة حكم المحدث : [صحيح] ا

٦- جل و بەرگێکی ئاسایی بێ، ئەوەندە گرانبەها نەبێت کە لەنێو کۆمەڵگەدا شاز بێت. واتە نابێت پۆشاکێك بێت ناوبانگی پێ دەربکات. هەروەك پێغەمبەری خوا (درود و سڵاوی خوای گەورەی لێ بێت) دەفەرمووێت: (مَن لَبِسَ ثوبَ شُهرةٍ في الدُّنيا، ألْبَسَهُ اللهُ ثوبَ مَذلَّةٍ يومَ القيامةِ)[1].

واتە: هەرکەسێك لە دونیادا پۆشاکێکی ناودەرکردوو بپۆشێت، خوای باڵادەست لە رۆژی دواییدا پۆشاکی زەبوونی لەبەر ئەو کەسە دەکات.

دیارە پۆشاکی بەناوبانگ و شوهرەتدار، جا یان لەبەر چاکی و گرانبەهایی بێت، یان لەبەر سەیری و دەگمەنی بێت، مادەم کەسێك بە مەبەستی ناو و شوهرەتدەرکردن لەبەری بکات، ئەوا دەکەوێتە بازنە و چوارچێوەی ئەو حوکمە.

٧- بۆندار نەکرابێ، چونکە بەکارهێنانی هەر جۆرە بۆنێک بۆ ئافرەت لە کاتی چوونەدەرەوەدا، حەرامە و دروست نییە، هەروەك پێغەمبەری خوا (درود و سڵاوی خوای گەورەی لێ بێت) دەفەرمووێت: (أيُّما امــــرأةٍ اسْتَعْطَرَتْ فمرَّتْ على قومٍ لِيَجِدُوا رِيحَ

---

شرح الحديث

(١) الراوي : عبدالله بن عمر | المحدث : محمد ابن عبد الوهاب | المصدر : الحديث لابن عبدالوهاب | الصفحة أو الرقم : ٢٩١/١ | خلاصة حكم المحدث : إسناده جُيد | التخريج : أخرجه أبو داود (٤٠٢٩)، والنسائي في ((السنن الكبرى)) (٩٥٦٠)، وابن ماجه (٣٦٠٧)، وأحمد (٥٦٦٤) واللفظ له

ها فهيَ زَانيَةٌ ، وكلُّ عينٍ زَانيَةٌ).[١]

واتە: هەر ئافرەتێك بۆن (عەتر) بە کار بێنێت و بە بۆنی خۆشەوە بە لای کۆمەڵێك پیاودا بڕوات و بۆنەکەی بڵاو ببێتەوە و ئەوان هەست بە بۆنەکەی بکەن، ئەوا ئەو ئافرەتە گوناهەکەی وەك ئەوە وایە کە زینای کردبێت.[٢]

٨. دوا خاڵیان بریتییە لەوەی کەوا جل و بەرگی ئافرەتانی موسوڵمان بێت و بە هیی کافران نەچێت، هەروەك پێغەمبەری خوا (درووود و سڵاوی خوای گەورەی لێ بێت) دەفەرمووێت: رَأَى النَّبيُّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ عَلَيَّ ثَوْبَيْنِ مُعَصْفَرَيْنِ، فَقالَ: أأُمُّكَ أَمَرَتْكَ بهذا؟ قُلتُ: أَغْسِلُهُمَا؟ قالَ: بَلْ أَحْرِقْهُمَا)[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوری عەمری کوری عاس (خوا لێیان رِازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (درووود و سڵاوی خوای گەورەی لی بێت) جلێکی موعەسفەر (بە سوور ڕەنگکراو)ـی لەبەرمدا بینی و

---

(١) الراوي : أبو موسى الأشعري ا المحدث : الألباني ا المصدر : صحيح الترغيب الصفحة أو الرقم : ٢٠١٩ ا أحاديث مشابهة ا خلاصة حكم المحدث : حسن ا شرح حديث مشابه

(٢) ئەو زینایەی کە لە فەرموودەکە باسی لێوە کراوە، وەك زینای داوێنپیسی نییە!

(٣) الراوي: عبدالله بن عمرو ا المحدث : مسلم ا المصدر : صحيح مسلم ا الصفحة أو الرقم: ٢٠٧٧ ا خلاصة حكم المحدث : [صحيح] التخريج : من أفراد مسلم على البخار

پێی فەرمووم: دایکت پێی گوتووی کە ئەم جلانە بپۆشی؟ منیش گوتم: ئایا بیانشۆم و ڕەنگەکەی لا بدەم؟ ئەویش گوتی: نەخێر، بەڵکوو بیانسووتێنە!

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی (إنَّ هذه من ثِيابِ الكُفَّارِ فَلا تَلبَسهُا)، واتە: ئەو جلانە جل و پۆشاکی کافر و بێباوەڕەکانن، بۆیە مەیان پۆشە.

بە داخەوە هەندێك لە ئافرەتان بۆن لە خۆیان و جل و بەرگەکانیان دەدەن، پاشان دەڵێن: ئێمە لە کاتی چوونەدەرەوە بۆنــمان بە کار نەهێناوە! لە دوای لێکۆڵینەوەی زانستی دەرکەوتووە پیاو کاتێك سەیری ئافرەتێك دەکات، ئەگەر ئەو ئافرەتە بۆندار بێت، کاریگەریی دوو ئەوەندە دەبێت بۆ لەیادکردنی لەسەر هەست و سۆز؛ پێویستی بە دوو ئەوەندە کات هەیە بۆ لەیادکردنی و دەرکردنی لە بیر و هەست و هۆشی.

زانایانی شەرعناس فەرموویانە: بالاپۆشی پێنج (٥) شت دەگرێتەوە:

١- پۆشینی سەر و قژ.

٢- پۆشینی هەموو جەستە جگە لە دەست و دەم و چاو[١].

---

(١) داپۆشینی دەست و ڕوخساریش ڕا و بۆچوونی جیاوازی لەسەرە. هەندێك لە شەرعناسەکان بە واجبی دەزانن، هەندێکی دی بە سوننەت و موستەحەبی دەزانن.

٣- بەکارنەهێنانی موکیاج و دەستکارینەکردنی برۆ.

٤- بەکارنەهێنانی بۆن.

٥- نەڕۆیشتن بە لەنجەولار.

## گرنگترین سوودەکانی باڵاپۆشی

١- باڵاپۆشی هۆکارێکە بۆ پاکڕاگرتنی دڵ و دەروونی ئافرەتان و پیاوانی بڕوادار و بنیاتنانیان لەسەر بناغەی لەخواترسی و بەگەورەزانینی قەدەغەکراوەکان. ئەم ڕاستییەش لە قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ کراوە لە سوورەتی (الأحزاب)، وەك خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ۝٥٣﴾.

واتە: ئەم جۆرە ڕەفتارە چاکتر و پاکترە بۆ دڵی ئێوە «ئەی پیاوەکان»، وە بۆ دڵی ئەوانیش «واتە: ئافرەتەکان».

لەم ئایەتە پیرۆزە پەروەردگار وەسفی حیجابی بە پاکی کردووە بۆ دڵ و دەروون، چونکە تا چاو نەبینێت، دڵیش حەزی بۆی ناچێت.

٢- باڵاپۆشی پاسەوانێکی شەرعیی بەهێزە بۆ پاراستنی ئابڕوو، هەروەها پاراستنی لە هۆکارەکانی گومان و ئاشووب و تێکدانی خێزان و کۆمەڵگە.

٣- باڵاپۆشی بانگکەرە بۆ ڕێزگرتن لە خووڕەوشتی جوان و شەرم و شکۆ.

٤- باڵاپۆشی تاجێکی پڕ لە شکۆمەندییە بە سەر ئافرەتی بڕوادار و بەڵگەی پاکیی ناوەڕۆکیان لە ڕواڵەتدا دەر دەخات، بگرە قەڵغانێکە

بۆ پاراستنیان لە بەدڕەوشتی و داوێنپیسی.

٥- بالآپۆشی یەکێکە لە درووشمەکانی ئیسلام، ناسنامەیەکی پڕ لە شکۆیە بۆ ئافرەتی بڕوادار.

٦- بالآپۆشی بەڵگەی ژیری و تێگەیشتنی ئافرەتی بڕوادارە لە سروشتی ڕەگەزی بەرانبەر، چونکە ئافرەتی بڕواداری ژیر هەروا بە خۆڕایی خۆی تووشی ئازار و کێشەو تانە و تەشەری گەنجانی شەهوانی ناکات؛ گۆشت ناخاتە بەردەم پشیلە و پاشان گلەییی خواردنی لێ بکات. ئەوەتا پەروەردگار لە سووڕەتی ئەحزابدا کاتێك باسی هۆکاری دەرکردنی فەرمانی بالآپۆشی کردووە، لەپێناو بەرژەوەندیی ئافرەت و دوورخستەوەی ئازار بووە لێی، وەك دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ﴿٥٩﴾ ﴾، واتە: ئەوە لەبارترین شتە کە پێی بناسرێن، تا ئازار نەدرێن، «تووشی گیروگرفت نەبن».

٧- بالآپۆشی ملکەچی و پەرستشێکە، زانایانی شەرعناس فەرموویانە: ئافرەتی بالآپۆش، پاداشتی بە (ڕۆژ) ڕۆژووگرتن و بە (شەو) شەونوێژکردنی بۆ هەژمار دەکرێ.

٨- بالآپۆشی واتە: پۆشینی جل و بەرگی لەخواترسی و بڕوا و متمانەبوونە بە کاربەجێیی فەرمانەکانی پەروەردگار، کە پڕن لە کاربەجێیی و سوود بۆ بەندەکانی، وەك خوای پەروەردگار دەفەموێ:: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَٰرِي سَوْءَٰتِكُمْ وَرِيشًا ۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ۚ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٢٦﴾ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ

ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآۚ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡۗ إِنَّا جَعَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾الأعراف.

واتە: ئەی نەوەی ئادەم! ئەوە پۆشاکمان دابەزاندووەتە سەرتان و عەورەتەکانتان دادەپۆشێ و جوانتان دەکا و دەشتانڕازێنێتەوە، چاکتر لەوەش پۆشاکی پارێزکارییە. ئەو «ڕەخساندنی پۆشاك»ـەش لە نیشانەکانی خوایە، بەشکوو بێتەوە یادیان «کە چۆن بژین و بە ڕێوە بچن!» ئەی نەوەی ئادەم! «وریا بن» شەیتان فریوتان نەدات، وەك چۆن باب و داکتانی وەدەر نا، پۆشاکەکانی لێ داڕنین تاکوو عەورەتی خۆیانیان پێ نیشان بدات. بە دڵنیاییەوە خۆی و کۆمەڵەکەی ئێوە دەبینن، «بەڵام» ئێوە نایانبینن، «واتە: ئیبلیس و کۆمەڵەکەی ئێوە دەبینن، بەڵام ئێوە ئەوان نابینن»، مسۆگەر ئێمە شەیتانەکانمان کردوونە دۆست و نزیکی ئەوانەی کە بڕوا ناهێنن.

سەرەڕای ئەوەش، پەروەردگار ئەو جوانییە بەرچاوەی کە ئافرەتان بە هۆی باڵاپۆشییەوە لە دەستی دەدەن، بۆیان قەرەبوو دەکاتەوە بە جوانییەکی ناوەکیی پڕ لە نوور، کە دڵەکان بە سەیرکردنی ڕووناك دەبنەوە.

٩- باڵاپۆشی هۆکارێکە بۆ ڕێگەگرتن لە حەزە شەیتانییەکان، لە دەرکەوتنی ئافرەت بە شێوەی نیمچەڕووت و ڕاکێشانی سەرەنجی

پیاوان و جوولاندنی هەست و سۆز و ئارەزووە سێکسییەکان و دواجار ڕوودانی تێکەلاوی و سێکسی ناشەرعی.

١٠- بالاپۆشی نیشانەی شەرم و شکۆیە (الحیاء)ـە، کە لە (حیاة) ـەوە هاتووە، واتە: بوونی ژیانێکی پڕ لە سەربەرزی و شکۆمەندی. ئەمەش فیترەت و سروشت و بناغە و بنچینەی پاکی ئافرەتی بڕوادارە. باوەڕی پتەوی وای لێ دەکات سروشتی ناسك و پاك و حەیا و حورمەتی خۆی بپارێزێ و هەرگیز خۆی بچووك نەکاتەوە بە پۆشینی جل و بەرگی تەسك و کورت و سەرنجڕاکێش و نیمچەڕووت، بەلکوو گەورەیی خۆی لە بالاپۆشیدا دەبینێتەوە.

ئەوەتا پێغەمبەری خوا (درووود و سلاوی خوای گەورەی لێ بێت) فەرموویەتی: {«إِنَّ اللَه عَزَّ وَجَلَّ حَيِيٌّ سِتِّيرٌ يُحِبُّ الْحَيَاءَ وَالسَّتْرَ فَإِذَا اغْتَسَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَتِرْ»}[1]

واتە: بێگومان خوای زالی پایەدار زیندوو و داپۆشەرە و حەزی بە شەرم و شکۆیە. داپۆشەری (عەیبانە)، بۆیە هەر یەکێك کە خۆی شۆرد، با خۆی (باش) داپۆشێ.

١١- بالاپۆشی نیشانەی باوەڕە، ئەوەتا پەروەردگار فەرمانی بالاپۆشی تەنیا ئاڕاستەی ئافرەتانی بڕوادار کردووە، وەك لە

---

(١) أخرجه أحمد برقم: (١٧٩٩٩)، وأبو داود برقم: (٤٠١٢)، والنسائي برقم: (٤٠٦)، وصححه الألباني في «صحيح سنن أبي داود».

سوورەتی (النور)ـدا دەفەرمووێ: ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ﴿٣١﴾ ﴾.

واتە: بە ئافرەتانی بڕوادار بڵێ: چاویان بپارێزن (لە تەماشاکردنی نامەحرەم)، داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناهـ و جوانیی خۆیان دەرنەخەن، جگە لەوەی کە دەردەکەوێ و دیارە، وەك (دەستەکان و دەم و چاو).

هەروەها پەروەردگارمان دەفەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ...﴿٥٩﴾ ﴾.

واتە: ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)! بە هاوسەرانت و کچەکانت و ئافرەتانی بڕوادار بڵێ: با بە پۆشاکی پۆشتە و باڵاداپۆشەر خۆیان بپۆشن..

١٢- باڵاپۆشی پاراستنی ئافرەتە لە حەسوودی و چاوپیسیی کەسانێك کە ئێرەییبەر و چاوپیسن، بە تایبەتی ئەگەر ئافرەت خاوەنی قژ و دەم و چاو و بەژن و باڵایەکی شۆخ و شەنگ و جوان بوو.

١٣- لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە کاتێك ئافرەتێکی باڵاپۆش دەبینرێ، دەڵێن: ئەم ئافرەتە موسوڵمانە، بڕوادارە. باڵاپۆشییەکەی، لە ئافرەتی نەسرانی و جوولەکە جیای دەکاتەوە.

## سوودەکانی بالاپۆشی لە ڕووی زانستییەوە

١- لە دەرەنجامی چەند توێژینەوەیەکی زانستیی نوێ، ئاماژەیان بەوە کردووە کە دەرخستنی بەشێك لە جەستەی ئافرەت و پۆشینی جل و بەرگی نیمچەڕووت، هۆکارە بۆ تووشبوون بە چەند نەخۆشییەك. لە ترسناکترینی ئەو نەخۆشییانە، شێرپەنجەیە، بە تایبەتی ئەو بەشانە دەگرێتەوە کە بەردەوام دەردەکەون، هەروەکوو لە گۆڤارێکی پزیشکیی بەریتانیدا هاتووە کە شێرپەنجەی (المیلا نوما) -کە یەکێکە لە جۆرەکانی شێرپەنجە ترسناکەکان-، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕێژەی تووشبووان بەم نەخۆشییە سەختە ڕووی لە زیادبوونە، بە تایبەتی لەنێو ئەو کچ و ئافرەتە گەنجانەی جل و بەرگی کورت و تەسك دەپۆشن، کە ئەمەش ڕاستەوخۆ دەبێتە هۆکاری بەریەککەوتنی تیشکی خۆر و تیشکی سەروو-وەنەوشەیی، کە بەڕێژەیەکی زۆر بە درێژاییی ساڵ کە بەر لاشەی ئافرەت دەکەوێت، ئەگەرچی جلی نایلۆن و گۆرەویی تەنك و لاستیکیان پۆشیبێت، بەڵام لە توێژینەوەکان دەرکەوتووە ئەم جۆرە جلانە هیچ لە زیانەکانی کەم ناکاتەوە.

هەڵبەتە ئەم دوو جۆرە تیشکە لە سەرەتادا وەك پەڵەیەکی بچووك لە شوێنێکی جەستە بە ڕەنگی ڕەش دەر دەکەوێت، بە تایبەتی لە

ڕوخسار یان لە دەست و قاچ دەردەکەوێت، پاشان بڵاو دەبێتەوە. کێشە گەورەکە لەوەدایە ئەم جۆرە شێرپەنجەیە چارەسەری نییە و، لە هەمان کاتدا بۆ کۆرپەلەی نێو سکیش دەگوازرێتەوە.

٢- لە ئاکامی کۆمەڵێك توێژینەوەی دیکەدا دەرکەوتووە پۆشینی سەرپۆش بۆ ئافرەتان سوودێکی زۆر گەورە و گرنگی هەیە، چونکە کاتێ تیشکی خۆر بەر سەر و قژ دەکەوێت، بە هۆی بوونی تیشکی هەمەجۆر و زیانبەخش لەنێو تیشکی خۆردا و، لەسەرووی هەموشیانەوە تیشکی سەروو-وەنەوشەیی، ئەم جۆرە تیشکە زیانی بۆ ئافرەت زۆر زیاترە وەك لە پیاو، چونکە ژێرپێستی ئافرەت (سمل تبقه الدهون) گەورەترە لە ژێرپێستی پیاو. تیشکی سەروو-وەنەوشەیی لەگەڵ ماددە پرۆتینییەکانی ژێر پێست کارلێك دەکەن، لە ئاکامدا دەبێتە هۆکاری سەرهەڵدانی چەند نەخۆشییەك، لە ترسانکترینیان شێرپەنجەی پێست و هەڵوەرینی قژە. هەروەها کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەسەر وشکبوونی قژ هەیە. لە کۆی دەرەنجامی توێژینەوەکان، دەرکەوتووە پۆشینی لەچك کاریگەریی ڕاستەوخۆی هەیە لە پاراستنی قژ لە وشکبوون و هەڵوەرین.

٣- دکتۆر (محمد ندا)، پسپۆڕ لە نەخۆشییەکانی پێست لە قاهیرە، جەخت لەوە دەکاتەوە کە بالاپۆشی پارێزگاری لە قژ دەکات، چونکە لێدانی تیشکی خۆر بە شێوەیەکی ڕاستەخۆ، دەبێتە هۆی لەدەستدان و هەڵوەرینی قژ، بە هۆی لاوازی و کاڵی لە ڕەنگیدا. هەروەها ئاماژەی بەوە کردووە لێدانی هەوا (ئۆکسجین) هۆکاری

وەرگرتنی ماددەی خۆراکی (تغذیة) نییە، چونکە ئەو بەشە دیارەی قژ دەکەوێتە تۆقی سەر(خلایا قرنیە) کە ژیانی تێدا نییە، بەڵکوو قژ پێداویستی خۆی لە ڕێگای پێست لەنێو خوێنەوە وەردەگرێت.

٤- دکتۆر (مەی السماحی)، پزیشکی پسپۆڕ لە زانکۆی (عین الشمس)، دەفەرمووێ: پۆشینی لەچك و بالاپۆشیی شەرعی. دوور و نزیك هیچ لێکەوتەیەکی خراپ (سلبی)ـی لەسەر قژ نییە، کە ئەمەش دوای توێژینەوە و تاقیکردنەوە لەسەر کۆمەڵێك ئافرەتی بالاپۆش و سفوور دەرکەوتووە کە بالاپۆشی هیچ پەیوەندییەکی بە هەڵوەرینی قژەوە نییە، بگرە بە پێچەوانەوە، پۆشینی لەچك قژ دەپارێزێت لە کاریگەرییە ژینگەییەکان و، ئاماژە بەوە دەکات باشترە وایە ئەو جۆرە لەچکانە بپۆشرێن کە لە لۆکە دروست کراون.

ناوبراو جەخت لەوە دەکاتەوە کە دوو هۆکاری سەرەکیی قژهەڵوەرین هەن، کە بریتین لە:

أ - باری دەروونیی ناجێگیر. زاڵبوون بەسەر دوودڵی و دڵەڕاوکێ و غەم و خەفەت، هۆکاری باشن بۆ ڕێگەگرتن لە هەڵوەرینی قژ.

ب-ناتەندروستی، چونکە قژ ڕاستەوخۆ خۆراك لە جەستە وەردەگرێت، ڕەنگە جەستەش کێشەی کەمیی خۆراکی هەبێ، بە تایبەتی سەوزە و میوە و پڕۆتیاتەکان. گرنگیدان بە تەندروستی و هەمەچەشنکردنی خواردن و زیادبەکارنەهێنانی شامپۆ و کرێم، هۆکارێکە بۆ بەرگرتن لە هەڵوەرینی قژ.

٥- زانایانی ڕۆژاوا بە شێوەیەکی بەردەوام لە سەرجەم هۆکارەکانی ڕاگەیاندندا، بە هۆی زیادبوونێکی ترسناك لە ڕێژەی دەستدرێژکردنی سێکسی (الإغتصاب)، جەخت لەسەر پێویستی بالاپۆشیی ئافرەتان و لێکجیاکردنەوەی هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ دەکەنەوە.

لە سەرژمێرییەك لە وڵاتی ئەمەریکادا دەرکەوتووە ساڵانە یەك میلیۆن کۆرپەلە بە شێوەی ناشەرعی پەیدا دەبن و یەك میلیۆن کۆرپەلەش کە بە شێوەی ناشەرعی دروست بوون، لە بار دەبردرێن. هەروەها ئێستا لە جیهان بە هۆی تێکەڵبوونی ناشەرعییەوە، چل میلیون کەس لە سەرتاسەری جیهاندا تووشی نەخۆشیی ئایدز بوونە، کە ئەمانە جەستەیان خاپوور بووە و بەرەو مردن هەنگاو دەنێن.

## بەڵگەکانی فەرزبوونی بالاپۆشی لە قورئان و سوننەتدا

١- خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ ﴾ الأحزاب.

واتە: بۆ هیچ پیاوێکی بڕوادار یان ئافرەتێکی بڕوادار نییە کاتێك خوا و پێغەمبەرەکەی بڕیاری شتێك بدەن، ئەوان سەرپشك بن (لە کردنی ئەم کارە)، چونکە ئەوی سەرپێچی لە فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی بکات، ئیدی ئەوە بە ئاشکرا گومڕا و سەرلێشێواوە[1].

٢- وە خوای بالادەست دەفەرمووێ: ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ﴿٣١﴾ ﴾.

واتە: بە ئافرەتانی بڕوادار بڵێ: چاویان بپارێزن (لە تەماشاکردنی نامەحرەم)، داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناهـ و جوانیی خۆیان دەرنەخەن، جگە لەوەی کە دەردەکەوێ و دیارە، وەك (دەستەکان و

---

(١) - تەفسیری ئاسان

دەم و چاو)[1].

٣- خوای کاربەجێ دەفەرمووێ: ﴿ وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ۝٣٣ ﴾ الأحزاب.

واتە: ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، لە ماڵەکانی خۆتان بە سەنگینی و سەلاری بسرەوون، جوانیی خۆتان دەرمەخەن، وەك سەردەمی نەفامیی یەکەم.

٤- خوای گەورە بە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَـٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ..۝٥٣ ﴾الأحزاب.

واتە: ئەگەر داوای شتێکی پێویستتان لە (هاوسەرانی پێغەمبەری خوا کرد)، لە پشتی پەردەوە داوایان لێ بکەن، ئا ئەو جۆرە رەفتارە چاکترە و پاکترە بۆ دڵی ئێوەو ئەوانیش[2]..

٥- هەروەها پەروەردگارمان دەفەرمووێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَـٰبِيبِهِنَّ ...۝٥٩ ﴾.

واتە: ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)! بە هاوسەرانت و کچەکانت و ئافرەتانی بڕوادار بڵێ: با بە پۆشاکی پۆشتەو

---

(١) -پوختەی تەفسیر

(٢) تەفسیری ڕێبەر

باڵاداپۆشەر خۆیان دابپۆشن[١]..

٦- خوای گەورە لە وەسف و پێناسەی باوەڕداران فەرموویەتی:
﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخۡشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقۡهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾
النور: ٥٢

واتە: جا هەرکەس گوێڕایەڵیی خوا و پێغەمبەرەکەی بکات و لە خوا بترسێ و خۆی لە سەرپێچیی خوا بپارێزێ، ئەوە بە ڕاستی هەر ئەوانە سەرکەوتوون.[٢]

٧- وە لە سووڕەتی ئەعرافدا فەرموویەتی: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾.

واتە: ئەی نەوەی ئادەم! ئەوە پۆشاکمان دابەزاندووەتە سەرتان عەورەتەکانتان دادەپۆشێ و دەشتانڕازێنێتەوە، چاکتر لەوەش پۆشاکی خۆپارازتنە. ئەو (ڕەخساندنی پۆشاك)ـەش لە نیشانەکانی خوایە، بەڵکوو بێتەوە یادیان (کە چۆن بژین و بە ڕێوە بچن)[٣]!

٨- {«إِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ حَيِيٌّ سِتِّيرٌ يُحِبُّ الْحَيَاءَ وَالسَّتْرَ فَإِذَا اغْتَسَلَ

---

(١) تەفسیری ئاسان
(٢) پوختەی تەفسیر
(٣) - تەفسیری ڕامان

أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَتِرْ»}(١).

واتە: بێگومان خوای زاڵی پایەدار زیندووە و حەزی بە شەرم و شکۆ و داپۆشینە، بۆیە هەر یەکێك لە خۆی شۆرد، با خۆی (باش) داپۆشێت.

٩- پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێ: {أَيُّمَا امْرَأَةٍ نَزَعَتْ ثِيَابَهَا فِي غَيْرِ بَيْتِ زَوْجِهَا هَتَكَتْ سِتْرَ مَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ رَبِّهَا}(٢).

واتە: هەر ئافرەتێك جل و بەرگی خۆی داکەند، جگە لە ماڵی هاوسەرەکەی، ئەوە شەرم و شکۆ و پەردەی نێوان خۆی و پەروەردگاری شکاندووە!

١٠- ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لە لاپەڕە (٤٩٠)ی بەرگی (٨)ی (فتح الباری)دا دەڵێ: (قَالَتْ إِنَّ نِسَاء قُرَيْش لَفضلاء وَلكنّي وَالله مَا رَأَيْتُ أَفْضَل مِنْ نِسَاء الأَنْصَارِ أَشَدّ تَصْدِيقاً بِكِتَابِ اللهِ وَلاَ إِيْمَانَاً بِالتَّنْزِيلِ..)

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، فەرموویەتی: ئافرەتانی قورەیش خاوەن فەزڵ و بەخششی خوان، بەڵام وەڵڵاهی هیچ ئافرەتێکم نەبینیوە وەك ئافرەتانی پشتیوانان کتێبی خوای گەورەیان بە ڕاست زانیبێ و بڕوایان بە قورئان بێ.

---

(١) أخرجه أحمد برقم: (١٧٩٩٩)، وأبو داود برقم: (٤٠١٢)، والنسائي برقم: (٤٠٦)، وصححه الألباني في «صحيح سنن أبي داود».

(٢) أخرجه أحمد برقم: (٢٥٦٦٨)، وابن ماجه برقم: (٣٧٥٠)، والحاكم وغيرهم.

١١. ئەسمائی کچی ئەبووبەکری سددیق (ڕەزای خوای گەورەیان لێ بێت) دەڵێت: (كنا نُغطِّي وجوهَنا من الرجالِ)[١]

واتە: ئێمە داب و نەریتمان وا بوو کە لە ئاست پیاواندا ڕووی خۆمانمان دادەپۆشی.

١٢- کۆمەڵەی زانایانی شەرعناس یەکدەنگن لەسەر پێویستیی پۆشینی ئافرەت بۆ سنووری عەورەتی خۆی. دیارە زانایانی شەرعناس دەربارەی عەورەتی ئافرەت دوو بۆچوونیان هەیە:

کۆمەڵەی یەکەم: ڕایان وایە کە عەورەتی ئافرەت بریتییە لە تێکڕای جەستەی، بێجگە لە دەم و چاو و هەردوو دەستەکانی بێجگە لە مەچەکی.

کۆمەڵەی دووەم: ڕایان وایە کە سەرجەم جەستەی ئافرەت عەورەتە و نابێت هیچ شوێنێکی بە دەرەوە بێت بەرانبەر بە پیاوی بێگانە.[٢]

---

(١) الراوي: أسماء بنت أبي بكر | المحدث: الألباني | المصدر: إرواء الغليل الصفحة أو الرقم : ٢١٢/٤ | أحاديث مشابهة | خلاصة حكم المحدث: صحيح على شرط الشيخين | شرح الحديث

(٢) بڕوانە: المفصل في أحكام المرأة و البيت المسلم | لا ١٨٣-١٨٤| ب ٣

## سزا و تاوانی خۆپۆشتەنەکردن بە حیجابی شەرعی

١. پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێ: {صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا: قَومٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ البَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ، وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ مُمِيلاَتٌ مَائِلاَتٌ، رُؤُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ البُخْتِ المَائِلَةِ لاَ يَدْخُلْنَ الجَنَّةَ، وَلاَ يَجِدْنَ رِيحَهَا، وإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكذَا}[1].

واتە: دوو چین لە ئەهلی ئاگرن، نەمبینیون: کۆمەڵێکیان قامچیان بە دەستەوەیە و بە ستەم لە خەڵك دەدەن و، کۆمەڵێکیان ئافرەتانێکن کە بە جلی نیمچەڕووتەوە دەردەکەون، لە ڕێگادا بە لەنجەولار دەڕۆن تا سەرنجی پیاوان بۆ لای خۆیان ڕابکێشن. قژیان دەبەستن و کۆی دەکەنەوە تا لەسەر تەوقی سەریان وەك کۆپارەی وشتری لێ دەکەن. ئا ئەم ئافرەتانە ناچنە بەهەشتەوە و بۆنیشی ناکەن، سەرەڕای ئەوەی بۆنی بەهەشت چەندەها ساڵەڕێ دەڕوات.

٢. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدْخِلْهُ نَارًا خَـٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ مُّهِينٌ

---

(١) أخرجه أحمد برقم: (٨٦٥٠)، ومسلم برقم: (٢١٢٨)، وأبو يعلى برقم: (٦٦٩٠).

﴿ ... ﴾ النساء: ١٤

واتە: (هەر کەسێکیش سەرپێچیی خوا و پێغەمبەرەکەی بکات و سنوورەکانی خوا ببەزێنێت، دەیخاتە ئاگرێکەوە هەمیشە دەمێنێتەوە تێیدا و سزایەکی ڕیسواکەری بۆ هەیە)[1].

٣. پێغەمـــبەری خـــوا (دروود و سڵاوی خوای گەورەی لێ بێت) دەفەرموویت: (ثلاثةٌ لا تَسألُ عنهمْ: رجلٌ فارَقَ الجماعةَ و عَصَى إمامَهُ و ماتَ عاصيًا ، و أمَةٌ أو عبدٌ أبقٌ من سَيِّده فماتَ ، وامْرأةٌ غابَ عنْها زوجُها و قدْ كفاها مُؤنةَ الدنيا فتبرَّجَتْ بَعدَهُ ؛ فلا تَسألْ عنْهمْ)[2]

واتە: سێ جۆر کەس هەن دەربارەیان هیچ مەپرسن، واتە: ئەوان تێداچوون: پیاوێك لە کۆمەڵەی موسوڵمانان دوور بکەوێتەوە و سەرپێچی سەرکردەی موسوڵمانانی کردبێت و لەسەر ئەم سەرپێچییە بمرێت، وە کۆیلەیێك ڕابکات لەژێر دەستی خاوەنەکەی و نەگەڕێتەوە تا دەمرێت، وە ئافرەتێك پیاوەکەی بڕوات و سەفەر بکات و هەموو پێویستییەکانی بۆ دابین کردبێت و لەگەڵ ئەوەدا خۆی و جوانیی خۆی بۆ پیاوانی نامەحرەم بەدەر بخات.

---

(١) - پوختەی تەفسیر

(٢) الراوي: فضالة بن عبيد | المحدث: الألباني | المصدر: صحيح الجامع الصفحة أو الرقم : ٣٠٥٨ | أحاديث مشابهة | خلاصة حكم المحدث: صحيح

## چەند ئامۆژگارییەکی بەسوود

١- بالاپۆشی ملکەچی و گوێڕایەڵییە بۆ فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم). ئایا تۆ ناتەوێ یەکێك بیت لەو کەسانەی ملکەچ و گوێڕایەڵن بۆ فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و، ئەم مژدە خۆشە وەربگری هاوڕێ لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و چاکەکاران بیت لە بەهەشتدا؟! وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ﴾النساء.

واتە: (هەر کەسێکیش فەرمانبەرداری خوا و پێغەمبەر بێت، ئەوە ئەوانە لەگەڵ کەسانێکدان کە خوا چاکەی لەگەڵ کردوون، لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و ساڵحان، ئەوانەش باشترین هاوەڵن)[1].

٢- نەپۆشینی حیجاب، مانای سەرکەشیکردن و بێفەرمانیکردنی خوا و پێغەمبەرەکەیەتی. پەروەردگاریش زۆر بە توندی ئاگادارمان دەکاتەوە لە سەرپێچیکردنی فەرمانەکانی، بە توشبوونی بە فیتنە و ئاشووب لە ژیانی دونیا و سزایێکی بەئازار و، دەفەرمووێ:

---

(١) - تەفسیری ڕێبەر

﴿ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ ﴾النور.، با وریا بن و بترسێن ئەوانەی سەرپێچی لە فەرمانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەکەن، یان تووشی فیتنە و ئاشووب دەبن لە ژیانی دونیادا، یان تووشی سزایەکی بەئازار دەبن..

٣- خوشکە ئازیزەکەم، تۆ خۆت وێنە و ناسنامەی خۆت دیاری بکە، ئایا تۆ وێنەی عائیشە و فاتیمەو ئاسیا و مەریەمیت؟ یان وێنەی خێزانەکانی لووت و نووح و ئەبوولەهەبیت؟

٤- باڵاپۆشی ملکەچییە؛ خواپەرستییە؛ تاجە؛ پاکییە؛ سترە؛ لەخواترسییە؛ باوەڕە؛ شەرم و شکۆیە؛ غیرەتە... ئایا ڕەتکردنەوەی هەموو ئەو وەسفە جوانانە مانای چی دەگەیەنێ، مەگەر بێئاگایی نەبێ؟! دیارە لەم بێئاگاییيەشدا تەمەن ون دەبێت، هەروەکوو وتراوە لە گیرفانی دڕاو پارە ون دەبێ.

٥- سەرقاڵبوون بە شێوەیەکی بەردەوام بە خۆڕازاندنەوە و جل و بەرگ بۆ دەرەوەی ماڵ، کات و ژیان لە دەست دەدەن و، گرنگیدان بە ناوەڕۆك و خۆدەوڵەمەندکردن بۆ بەهێزکردنی توانا و لێهاتوویی کز دەکات.

هەڵبەتە توانا و لێهاتوویی ئافرەت پێوەرێکی سەرەکییە بۆ هەڵبژاردن و بوونی بە کەسێکی سەرکردە و پێشڕەو، لە کاتێکدا لە وڵاتی پاکستان خاتوون «فاتیمە نەجاح» لەگەڵ «ئەیووب

خان»، هەردووکیان بۆ سەرۆکایەتیی پاکستان پاڵێورابوون، پێشبرکێیەکی بەێیز لە نێوانیاندا هەبوو. لەو سەردەمەدا (ئەبوو ئەعلای مەودوودی) گەورەترین زانای ئەو سەردەمە بوو، لە فتوایەکیدا داوای لە دەنگدەران کرد کە دەن بە خاتوو (فاتیمە نەجاح) بدەن، چونکە ئەو توانا و لێهاتوویی زیاترە.

٦- بەروبوومی چاك و بەسوود لە زەویی چاك و پیت و بەفەڕدا بەرهەم دێت. ئەو دایکەی خۆی پاك و گوێڕایەڵ و ملکەچە بۆ فەرمانەکانی خوا و قورئانخوێنە و پێوەستە بە قورئانەوە، دەبێت بە پێشەنگێکی چاك بۆ جگەرگۆشەکانی خۆی و، بە تایبەتی کچەکانی، وەك خۆی بالاپۆش و ملکەچ و گوێڕایەڵ دەبن بۆ فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەری خوا و، لە ڕۆژی دواییش شایانی تاجی ویقار و سەرفرازی و ئەمانەتپارێزی دەبێت.

پێغەمبەری خوا (درود و سڵاوی خوای گەورەی لێ بێ) دەفەرمووێ: {عَنْ أَبو سَعيد رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ نَبيُّ الله «صَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ»: «يُقَالُ: لصَاحب الْقُرْآن يَوْمَ الْقيَامَة إذَا دَخَلَ الْجَنَّةَ، اقْرَأْ وَاصْعَدْ، فَيَقْرَأُ وَيَصْعَدُ، بكُلِّ آيَة دَرَجَةً، حَتَّى يَقْرَأَ آخرَ شَيْءٍ مَعَهُ»}[1]

واتە: ئەبوو سەعیدی خودری (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: بە هاوەڵی

---

(١) رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٧٨٠)، وَصَحَّحَهُ الألباني في «الصحيحة».

قورئان دەگوترێ (واتە: ئەو کەسەی قورئانی لەبەر کردووە) کە دەچێتە بەهەشت، بخوێنە و بەرز ببەوە و سەر بکەوە. جا هەر دەخوێنێ و سەردەکەوێ، بە هەموو ئایەتێك پلەیەك، هەتاکوو کۆتا ئایەت کە پێیەتی، (واتە: کە لەبەریەتی و تێی گەیشتووە و کاری پێ کردووە).

ئیبن قەیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)، دەڵێ: پلەکانی بەهەشت بە ئەندازەی ژمارەی ئایەتەکانی قورئانن، باوەڕدار چەند ئایەتی لەبەر بێ، ئەوەندە پلە بەرز دەبێتەوە.

{عَن أَبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَن النَّبيِّ «صَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ» قَالَ: «يَجيءُ الْقُرْآنُ يَوْمَ الْقيَامَة، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ! حَلِّه فَيُلْبَسُ تَاجَ الْكَرَامَة، ثُمَّ يَقُولُ: يَا رَبِّ! زِدْهُ فَيُلْبَسُ حُلَّةَ الْكَرَامَة، ثُمَّ يَقُولُ: يَا رَبِّ! ارْضَ عَنْهُ، فَيَرْضَى عَنْهُ، فَيُقَالُ لَهُ: اقْرَأْ وَارْقَ وَتُزَادُ بكُلِّ آيَة حَسَنَةً»}[1]

واتە: ئەبوو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: لە ڕۆژی قیامەتدا قورئان دێ (لەگەڵ ئەو کەسەی خوێندوویەتی لە دنیادا) دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! بیـڕازێنەوە و خشڵی لەبەر بکە. ئیدی تاجی ڕێزی لەسەر دەنرێ. پاشان دەفەرمووێ: زیاتری پێ بدە، ئینجا جل و بەرگی ڕێزی لەبەر دەکرێ و دەڕازێنرێتەوە. ئینجا قورئان دەفەرمووێ: ئەی

---

(١) رَوَاهُ الترمِذيُّ برقم: (٢٩١٥)، وَحَسَّنَهُ الألباني في (صحيح الجامع): (٨٠٣٠).

پەروەردگارم لێی ڕازی بە، خوای میهرەبانیش لێی ڕازی دەبێ.
ئینجا بەو کەسە دەگوترێ: قورئان بخوێنە و سەرکەوە (بۆ پلەکانی بەهەشت)، وە هەموو ئایەتێك چاکەیەکی بۆ هەیە.

## جل و بەرگی پارێزکاری و شەرم و شکۆ و چاکترینە

بەڕێزانم: ئەوە پەروەردگاری زانا و کارزان و لێزان و کاربەجێ بە ئێمەی بەندە دەفەرموویت: ﴿ وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ﴾ واتە: (جل و بەرگی تەقوا و پارێزکاری و شەرم و شکۆ و کردەوەی چاك و دەرنەچوون لە سنوورەکانی خوای کارزان، باشترینە).

هەڵبەتە پۆشەن و جل و بەرگ، گوزارشت لە ئایەت و بەخشش و نیشانەیەکی پەروەردگاری باڵا دەست دەکات، کە پێوەستە بە گشت مرۆڤێکی ژیر و پارێزکار و لەخواترس. ئەم بڕگەش لەم ئایەتە پیرۆزە وەرگیراوە کە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَٰرِي سَوْءَٰتِكُمْ وَرِيشًا ۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ۚ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾ الأعراف: ٢٦

واتە: ئەی ڕۆڵەکانی ئادەم! بێگومان ئێمە جل و بەرگێکمان پێداون کەموکورتی و عەیب و عەورەتتان دادەپۆشێ و هۆی جوانی و ئاراییشتانە، بەڵام جل و بەرگی تەقوا و پارێزکاری و شەرم و شکۆ و کردەوەی چاك و دەرنەچوون لە سنوورەکانی خوای کارزان، ئەوە لە هەمووی باشترە. دەسا ئێوە بە تەقواوە خۆ پێوەست بکەن. ئەو بەخششانەش بڕێکن لە نیشانەکانی دەسەڵات

و توانایی خوای باڵادەست، بەشکوو پەند وەربگرن و بیر بکەنەوە و بگەڕێنەوە لای خوای میهرەبان و شوکرانەبژێر بن[١].

شێخی شەعراوی (ڕەحمەتی خوای گەورەی لێ بێت) لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێت: سەرەتای ئایەتەکە پەروەردگاری باڵا دەست بە ( يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ ) گفتوگۆکردن لەگەڵ نەوەی ئادەم دەستی پێ کردووە. دیارە خوای دانا مەبەستیەتی ڕابردووی باوەگەورەمان ئادەم، لەگەڵ شەیتانی نەفرەتلێکراو، بە یادی نەوەی ئادەم بهێنێتەوە، کە ئاگادار بن شەیتان هێشتا ماوە، هەڵتان نەخەڵەتێنێت ئەو جل و بەرگە جوانەی کە پەروەردگاری کاربەجێ بۆی دابەزاندن بۆ داپۆشینی جەستە و وعەیب و عارتان و، پێدانی جوانی و ڕازاوەیی بە نەوەکانی ئادەم، وریا بن شەیتان لەبەرتان دانەکەنێت، چونکە یەکەم سەرکەشی و بێفەرمانی کە شەیتان بە باوە ئادەم و دایە حەوای کرد، بووە هۆکاری لەبەرکردنەوەی جل و بەرگیان.

ئەوجا خوای گەورە جل و بەرگێکی بۆ ئادەمیزاد دابەزاندووە بۆ داپۆشینی لایەنی ماددی و مەعنەویی عەیب و عاری ئادەمیزاد، هەروەها بۆ داپۆشین و خۆڕازاندەوەشە بە بەها باڵاکانەوە. پەروەگاری کارزان جگە لە دابەزاندنی جل و بەرگ بۆداپۆشین(وَرِيشًا)، شتی سەیری وەك پەڕی باڵندەی بۆ جوانی و خۆڕازاندنەوە بۆ دابەزاندوون. بۆیە لەنێو عەرەبەکان ئەگەر کەسێك شتی جوانی جگە لە جل و بەرگ و پێویستیی

---

(١) - تفسیری رامان

خۆپۆشتەکردنی هەبووایە، دەیانگوت فڵانە کەس (مریش)ـە، واتە ئەو کەسەلە لەوپەڕی هەبوونی و خۆشگوزەرانیدایە؛ جگە لەجل وبەرگی پێویست، کەلوپەلی جوانکارییشی هەیە!

(وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ) واتە جل و بەرگی پارێزکاری و خۆپارێزی و لەخواترسی، یەکێکە لە ئایەت و نیشانە سەیرەکانی قودرەت و هێز و توانا و دەسەڵاتی خوای باڵادەست. دیارە کۆمەڵێك بەهای بەرز و جوان هەن، بێ ئەم بەها و قیەمانە، ژیان پوخت و جوان و ڕێکوپێك و کۆکراوە نابێت. ئیتر خوای گەورە کۆمەڵە شتێکی ماددیی بۆ جوانکاری پێ بەخشیون، کەلە کاتی جەنگ و ئاشتیدا بە کاریان دەهێنن. جا ئەگەر ئێوە پڕۆگرام و بەرنامە و مەنهەجی پارێزکاری و لەخواترسی پیادە بکەن، ئەوە دڵنیا بن خوای باڵادەست هەموو ئەو شتانەتان پێ دەدات کە لە ئێوە ونە و هەستی پێ ناکەن.[١]

زانا و بیرمەندی مەزن سەید قوتب (ڕەحمەتی خوای گەورەی لێ بێت)، لە تەفسیرە بەهادارەکەیدا دەڵێت: وشەی (وَلِبَاسُ) بۆ پۆشەنێک بە کار دێت، کە جەستە دابپۆشێت، ئەوەش بریتییە لە جلی ژێرەوە. (والریاش) بۆ پۆشەرێک بە کار دێت هەم پۆشتە بێت وەهەم جوانی و قەشەنگی ببەخشێت،کە ئەمەش لەجلی سەرەوە بە دی دەکرێت. هەروەها(وَرِيشًا) بۆ ژیان و گوزەرانێکی چاك و پڕ لە نیعمەت بە کار دێت. جا هەموو ئەم مانایانە کە باس لە شەرعی پەروەردگاری کاربەجێ

---

(١) تفسير القرآن للشعراوي: (٧/١٢٥)

و جل و بەرگ و پۆشتەیی و جوانی و ڕازاوەیی، لەگەڵ خۆپارێزی و پارێزکاری و لەخواترسی، کە هەردووکیان پۆشەن و داپۆشەرن، ئەمیان بۆ پۆشتەیی جەستە و جوان و ڕازاوەکردن، ئەوەی تریان بۆ پۆشتەیی دڵ و پاك و ڕازاوەکردنی. جا هەر کەسێك هەستی لە خواترسی و پارێزکاری و شەرم و شکۆی لە خوای باڵادەست هەبێت، ئیتر لە ناخی ئەم هەستە بەرزەوە ڕقی و لە ڕووتکردنەوەی جەستە دەبێتەوە و قێزی لێ دەبێتەوە و شەرم و حەیای لێ دەکات. دیارە هەر کەسێك شەرم و شکۆ و خۆپارێزیی نەبێت لە خۆڕووتکردنەوە و بانگی خەڵك بکات بۆ خۆڕووتکرنەوە، هەڵبەتە ئەمە مانای خۆڕووتکرنەوەیە لە شەرم وشکۆ و خۆپارێزی و پاکیەتی و مرۆڤایەتی، هەروەها جێبەجێکردنی پیلانی شەیتان و یەهودییەکان و ماسۆنییەتە. بۆیە لە کۆتاییی ئەو ئایەتە خوای گەورە فەرموویەتی (لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ )، بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە کە خۆپۆشتەکردنی چاك، بەو شێوەیەی کە خوای گەورە داوای کردووە، ئا ئەم جۆرە کەسانە، لە فیترەت و سروشتی مرۆڤی باوەڕدار و ژیر و پاك جوان تێگەیشتوون و ڕازی بوون بە شەرع و پڕۆگرام و فەرمانی خوای باڵادەست. هەروەتر پاراستنی مرۆڤایەتییە لە ڕووخان و لەناوچوون. بەڵام خۆدەرخستن بە جلی نیمچەڕووتەوە، پێچەوانەی سروشت و فیترەتی ڕاست و دروست و هاوسەنگی ئادەمیزادە، ئینجا کەوتنە نێو پیلانی پیس و گڵاوی یەهوود و ماسۆنییەتە، کە ئامانجیان جگە لە ڕووتکردنەوەی مرۆڤایەتی لە جل وبەرگ، ڕووتکردنەوەی مرۆڤایەتییە لە ڕووی دەروونی و فکرییشەوە، وە گەڕانەوەی مرۆڤایەتی بەرەو سەردەمی نەزانی؛ دواجار وەك ئاژەڵ مامەڵە لەگەڵ نەوەی ئادەم بکەن.

ئیتر بە ئارەزووی خۆیان بەو شێوەی کە خۆیان مەبەستیانە و پیلانیان بۆ دارِشتووە، ئاراستەی بکەن)[1].

بەرِێزانە دانانی رِیش بۆ پیاوان، ئەوپەرِی جوانی و پیاوەتی و هەیبەت و سەنگینی بە رِەگەزی نێر دەبەخشێت. دیارە رِیش هێشتنەوە دروشم و سیمبولی پیاوەتی و هەیبەت و لەخواترسی و پارێزکارییە بۆ رِەگەزی نێر. بۆیە زۆرێك لە زانایانی شەرعناس وەك ئیبن باز (رِەحمەتی خوای گەورەی لێ بێت)، هێیشتنەوە و خزمەتکردنی رِیشێکی جوانیان بە فەرز و پێوست زانیوە و، تاشینیان بە قەدەغە و حەرام زانیوە[2]. هەڵبەتە پەیامبەری سەروەر (ﷺ) لە چەند فەرموودەیەکدا فەرمان بە هێشتنەوەی رِیش و کورتکردنەوەی سمێل دەکات، هەروەك پێشەوا بوخاری لە عەبدوڵڵای کورِی عومەرەوە بۆمان دەگێرِێتەوە کە سەروەر و ئازیزمان (ﷺ) فەرموویەتی: (خَالِفُوا الْمُشْرِكِينَ: وَفِّرُوا اللِّحَى، وَأَحْفُوا الشَّوَارِبَ) واتە: پێچەوانەی هاوبەشدۆزەوەکان بن، رِیشتان بهێڵنەوە، و چرِ و جوانی بکەن و، سمێلتان کورت بکەنەوە. ئەمەیە هاوسەنگیی ئایینی پیرۆزی ئیسلام؛ گرنگیی بە لایەنی دەرەکی لە رِووی شکڵ و شێوە و ناوەرِۆکیش دەدات.

---

(١) - تفسير في ظلال القران-( ٣/ ١٢٧٥)

(٢) -مجموعة الفتاوى ومقالات متنوعة – الجزء الثالث:( ٣٦٢)

٥- وفّروا: (الوفر) من التوفر وهو الابقاء، بمعنى ماأقتصد، ماأمكن ، والتَّوفيرُ هو التَّكثِيرُ.

٦- أخرجه البخاري (٥٨٩٢)، ومسلم (٢٥٩)

دیارە باڵاپۆشییش بۆ ئافرەتان ئەوپەڕی جوانی و شکۆمەنی و هەیبەت و سەنگینی و پاکێتی بە ڕەگەزی مێیینە دەبەخشێت. هەڵبەتە پەروەردگاری باڵادەست ئەو جوانییە بەرچاوەی کە ئافرەتان بە هۆی باڵاپۆشییەوە لە دەستی دەدەن، بە جوانییەکی ناوەکیی پڕ لە نوور و ڕووناکی بۆیان قەرەبوو دەکاتەوە، کە دڵەکان بە سەیرکردنیان گەش و ڕووناك دەبنەوە. هەڵبەت باڵاپۆشی دروشم و سیمبولی پاکی و لەخواترسی و پارێزکاری و شەرم و شکۆی ئافرەتی باوەڕدارە. بۆیە خوای گەورە باڵاپۆشیی لەسەر ئافرەتان فەرز کردووە.

## باڵاپۆشی ڕێگر نییە لە بەردەم سەرکەوتن و داهێنانی تۆ!

بە ئەزموون و تاقیکردنەوە دەرکەوتووە ئافرەت کە باڵاپۆش بێت، هەمیشە دڵی پڕ لە ئارامی و ئاسوودەیی دەبێ و، مێشك و ئاوەز و یادگەی پاك و بێگەرد و قووڵ و ورد دەبێت؛ بە پێچەوانەشەوە. بەڵام ئافرەتانێك کە باڵاپۆش نین، هەمیشە هەست بە نائارامی و دڵتەنگی دەکەن و زۆر جاریش لە لایەن ڕەگەزی بەرانبەرەوە تووشی بێزارکردن و تەنگپێهەڵچنین دەبنەوە! هەروەها ڕۆژانە دەیەها ئافرەت لە ئەورووپا و ئەمەریکا دوچاری دەستدرێژی سێکسی دەبنەوە ،بە تایبەتی لە کاتی شەودا!

دیارە خوای گەورە هەر وەك چۆن توانا و لێهاتوویی داوە بە پیاوان، بە هەمان شێواز ئافرەتانیش خاوەنی توانا و لێهاتووییەکی زۆرن، بە تایبەتی گەر بیەوێ توانا و لێهاتوویی و زیرەکی و بیرقووڵی و وردبینییەکەی خۆی بخاتە کار، لەم بارەشەوە نمونە زۆرن. یەکێك لەوانە کە نازناوی (دایکی داهێنەران)ـی پێ دراوە، ئەندازیاری میسری (لیلی عبدالمنعم)ـە کە لە ساڵی (١٩٤٩) لە قاهیرەی پایتەختی میسر لە دایك بووە. کۆلێجی ئەندازیاری تەواو کردووە و هەر لەم شارە کراوەتە سەرۆکبەشی پلان و جێبەجێکردن لە فەرمانگەی ئاوی قاهیرە. پاشان چووە بۆ (بەریتانیا) لە ساڵی

(٢٠١٢) و، دەست دەکات بە کۆمەڵێك توێژینەوە و تاقیکردنەوە. ئیتر داهێنانێکی بێوێنە دەکات و شاژنی بەریتانیا خەڵاتی پلەیەکی (کۆنفرانسی گلۆباڵ)ـی نێودەوڵەتیی پێ دەدات، بە هۆی داهێنانی جۆرە کۆنکرێتێك کە بەرگەی بوومەلەرزە دەگرێت.

خاتوو لەیلی کە هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەرە، لە چاوپێکەوتنێکدا گوتی: بیرۆکەی دروستکردنی ئەم کۆنکرێتەم لەم ئایەتە پیرۆزەوە بۆ هات کە خوای گەورە لە سوورەتی (الکهف) لە باس و سەرگوزەشتەی (ذو القرنین)ـدا دەفەرموویت: ﴿ ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلْحَدِيدِ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيْنَ ٱلصَّدَفَيْنِ قَالَ ٱنفُخُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارًا قَالَ ءَاتُونِيٓ أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا ﴿٩٦﴾ فَمَا ٱسْطَٰعُوٓاْ أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا ٱسْتَطَٰعُواْ لَهُۥ نَقْبًا ﴿٩٧﴾ ﴾ الکهف: ٩٦-٩٧

واتە : پارچە ئاسنم بۆ بهێنن و (کەڵەکەی بکەن)، هەتا ئەمبەر و ئەوبەری هەردوو کێوەکەی پڕ کرد. ئەوسا فەرمانی دا تا بە (موشەدەمە) فوو بکەن لەو ئاگرەی کە لە ژێریدا کرابۆوە، هەتا کاتێك هەمووی کرد بە ئاگر، ئینجا (ذو القرنین) گوتی: ئادەی مسی تواوەم بۆ بهێنن تا بیکەم بەسەریدا، (مس لەگەڵ ئاسندا تێکەڵ بکرێت پێکهاتەیەکی بەهێزی لێ دروست دەبێت)، ئەوسا ئیتر (یەئجوج و مەئجوج) نە توانییان سەربکەون، نە توانییان کونی تێ بکەن.[1]

دەڵێت ئیتر کە کۆمەڵێك تاقیکردنەوەم کرد لەسەر کۆنکرێتی

---

(١) تەفسیری ئاسان

شیشدار، تا گەیشتم بەوەی کە بەرهەمێکی نەوتی لەگەڵ کۆنکرێت تێکەڵ بکەم، تا کۆنکرێتەکە زیاتر بەرگەی بوومەلەرزە بگرێت. کە ئەمە بوو (ذو القرنین) کردی بۆ دروستکردنی دیواری نێو دوو شاخەکە.

کاتێك زانییان کە ئەم ئافرەتە داهێنەرە و سەد داهێنانی هەیە و سوودی بە مرۆڤایەتی گەیاندووە، ناویان نا (دایکی داهێنەران)، کە وەك ئەبوولهەول بێدەنگە و وەك ئەهرامەکانیش سەربەرزە[1]!.

هەروەها دکتۆرە تەهانی عامر کە بە ڕەچەڵەك ئافرەتێکی میسرییە، بەڕێوەبەری کارگێڕییە لە (وەکالەی ناسا) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، کە ئافرەتێکی بالاپۆشی دامەزراوی سەرکەوتووە. جگە لە پیشە گرنگ و هەستیارەکەی، خەریکی بانگەوازیشە، سەر لە کەنیسە و پەرستگەکانی ئەو وڵاتە دەدات و باسی جوانییەکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەکات، هەروەها هاوڕێیەکانی بۆ ماڵەکەی خۆی بانگهێشت دەکا و لە خۆراکی وڵاتەکەی خۆی بۆیان ئامادە دەکات. ئیتر ئەم کۆبوونەوانە دەکاتە دەرفەتێك بۆ گەیاندنی پەیامی قورئان و سوننەت[2].

ئەمەش وەڵامە بۆ هەموو ئەوانەی کە دەڵێن ئافرەتانی موسوڵمان بە هۆی بالاپۆشییەکەیانەوە دوا کەوتوون و ناتوانن داهێنان بکەن و، بێئاگان لەوەی کە چەندەها نموونەی ئافرەتی هاوشێوە

---

(١) یادەوەری و پەند- ئەندازیار عوسمان- بەرگی چوارەم

(٢) یادەوەری و پەند- ئەندازیار عوسمان- بەرگی چوارەم

توانیویانە لە بوارە جیاجیاکان ئەسپی خۆیان تاو بدەن و سوود بە دین و ژینی خەڵك بگەیەنن و، باڵاپۆشییش بۆیان وەك تاجی زێڕین بووە و هەرگیز نەبووەتە ڕێگر لە بەردەم خزمەتکردنی مرۆڤایەتی.

## با فریای خۆمان بکەوین، پێش ئەوەی مردن فریامان بکەوێت!

هەڵبەتە سوننەتی ژیان کۆتاییەکەی مردنە، مردنیش میوانێکی نادیار و ناوەختە. هەر کاتێك لە دەرگای ژیانمان بدات، بێدەسەڵاتین و دەبێت ملکەچ بین بۆ مردن. دیارە مردنیش وەك بۆمبێکی تەوقیتکراوە و لەنێو باخەڵی هەموو مرۆڤێك جێگیر کراوە، ئیتر زەنگی تەقینەوەی نادیارە و پەروەردگار لە کاتێکی نەزانراودا (نەزانراو بۆ ئێمە) فەرمانی بۆ دیاری کردووە و، مرۆڤی عاقڵ و ژیریش ئەو کەسانەن کە خۆیان بۆ ئەم مردنە ئامادە دەکەن و کاری بۆ دەکەن. هەر وەك پێغەمبەری ئازیز (درووود و سڵاوی خوای گەورەی لێ بێت)، فەرموویەتی: (الكَيِّس[1] مَنْ دَانَ نَفْسَهُ، وَعَمِلَ لِما بَعْدَ الْموْتِ، وَالْعَاجِزُ[2] مَنْ أَتْبَعَ نَفْسَه هَواهَا، وتَمَنَّى عَلىَ اللَّهِ )[3]واتە: مرۆڤی ژیر و ئاقڵ و هۆشمەند ئەو کەسەیە کە

---

(١) - أن الكيس من قهر نفسه وأخضعها لحكمة عقله وشريعة ربه فهو يحاسبها على كل ما تفعل وما تترك .

(٢) أما العاجز المقصرّ في الواجب فهو ذلك الذي ينقاد لهواه، فنفسه أسيرة شهواته، ويزيده حمقًا تمنيه على الله الأماني الكاذبة، فهو يعلل نفسه بعفو الله ومغفرته وسعة رحمته

(٣) رواه الترّمِذيُّ عن ابى يعلى شداد بن أوس وقالَ: حديثٌ حَسَنٌ

هەمیشە سەرزەنشتی خۆی دەکات و توێشوو بۆ دوای مردنی ئامادە دەکات، بەڵام کەسی ناژیر و نەزان بە دوای حەز و ئارەزووەکانی خۆی کەوتووە و بە هیوای چوونە بەهەشتە.

ئەکتەری تورکی (فاتیمە ئایدن) کە هەر لە منداڵییەوە چووەتە کارکردن لە بواری هونەر و، لە درامای (وادی الذئاب) ڕۆڵی بینیوە. ئیتر لە کاتی هەنگاونانی بەرەوە ناوبانگ و سەرکەوتن، ئامادە نەبوو بەبێ بالاپۆشی بێتە سەر تەختی خۆنیشاندان، بەڵکوو بە بالاپۆشی دەرکەوت. کاتێك پرسیاریان لێ کرد، بۆچی لەو کات و ساتە کە بەخت یاوەرت بوو، بە بالاپۆشی دەرکەوتیت؟!

لە وولامدا گوتی: دەترسم بمرم و فەرمانی خوای بالادەستم جێبەجێ نەکردبێت و خۆم دانەپۆشیبێت.)[1]

---

(١) - یادەوەری و پەند- ئەندازیار عوسمان- بەرگی چوارەم

## گرنگیدانی پێغەمبەر ﷺ به ئافرەتان و کچان

تاریکترین و ناخۆشترین ڕۆژەکانی مرۆڤ پێش هاتنی ئیسلام، بریتی بوو لە هاتنە دنیا و لەدایکبوونی کچۆڵەیەکی بەخشراوی خوا. لەو ڕۆژگارەدا هەر کەسێك موژدە و هەواڵی ئەوەی پێ درابا کچێکی بووە، زۆر هەستی بە شەرمەزاری دەکرد و زۆر بێهێز دەبوو، هەروەها دەم و چاویشی تاڵخ و ڕەش هەڵدەگەڕا لە بەرانبەر ئەم هەواڵەدا. بۆیە ڕاستەوخۆ بیری لەوە دەکردەوە چۆن بە زووترین کات هەوڵی لە ناوبردنی ئەو منداڵە بچووکەی بدات کە تازە چاوی بە دنیا هەڵێناوە. ئەمەش نەریتێك بوو زۆربەیان لەسەری پەروەردە بووبوون، وەك خوای پەنهانزان بۆمان باس دەکا و دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِالْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَارَىٰ مِنَ الْقَوْمِ مِن سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ ۚ أَيُمْسِكُهُ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ ۗ أَلَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾النحل، واتە: (بێبڕوایان) کاتێك یەکێکیان موژدەی کچێکی پێ بدرێ، دەم و چاوی ڕەش هەڵدەگەرێ و پیش دەخواتەوە، وە خۆی دەشارێتەوە لە خەڵکی، لەبەر ئەو موژدە خراپەی کە پێی دراوە. ئایا بیهێڵێتەوە و بە شەرمەزاری و سەرشۆڕی (و بە خێوی بکات)، یان زیندەبەچاڵی بکات؟! ئاگادار بن و بزانن ئای ئەوە چەندە

بڕیارێکی خراپە دەیدەن!)[١]

هەر دەربارەی زیندەبەچاڵکردنی کچۆڵان و پرسیارلێکرانیان لە ڕۆژی دوایی، خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ ۝٨ بِأَىِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ ۝٩ ﴾ التكوير، واتە: کاتێك پرسیار کرا لە کچانی زیندەبەچاڵکراو، کە بە هۆی چ گوناهێکەوە کوژران؟!! دیارە منداڵێك کە تازە بووە هیچ گوناهی نەبووە!

بەڵام دوای هاتنی شەریعەتی پڕحیکمەتی خوای پەروەردگار، بۆ دەربازکردنی هەموو بەندەکان، ئافرەتان بە گشتی و کچان بە تایبەتی، ڕێز و پلەوپایەی خۆیان بۆ گێڕدرایەوە. بۆ ئەوەی ئەم قسەمان بسەلمێنین، با سەرنج لەم دەقانەی خوارەوە بدەین:

{عَنْ أَنَس بْن مَالك رَضيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ): «مَنْ عَالَ جَاريَتَيْن حَتَّى تَبْلُغَا، جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَة أَنَا وَهُوَ»، وَضَمَّ أَصَابعَهُ} حَديثٌ صَحيحٌ[٢]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دوو کچۆڵە بە خێو بکات هەتا باڵغ دەبن، لە ڕۆژی قیامەت کە دێت، من و ئەو ئاواین، پەنجاکانی هێنا تەنیشت یەك!

{أَنَّ عَائشَةَ رَضيَ اللهُ عَنْهَا زَوْجَ النَّبيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ)

---

(١) تەفسیری ئاسان

(٢) (رَوَاهُ مَسْلمٌ: (٦٨٦٤))

قَالَتْ: جَاءَتْنِي امْرَأَةٌ وَمَعَهَا ابْنَتَانِ لَهَا فَسَأَلَتْنِي فَلَمْ تَجِدْ عِنْدِي شَيْئاً غَيْرَ تَمْرَةٍ وَاحِدَةٍ، فَأَعْطَيْتُهَا إِيَّاهَا، فَأَخَذَتْهَا فَقَسَمَتْهَا بَيْنَ ابْنَتَيْهَا وَلَمْ تَأْكُلْ مِنْهَا شَيْئًا، ثُمَّ قَامَتْ فَخَرَجَتْ وَابْنَتَاهَا، فَدَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): فَحَدَّثْتُهُ حَدِيثَهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنِ ابْتُلِيَ مِنَ الْبَنَاتِ بِشَيْءٍ فَأَحْسَنَ إِلَيْهِنَّ كُنَّ لَهُ سِتْرًا مِنَ النَّارِ»} حَدِيثٌ صَحِيحٌ[١].

واتە: عائیشەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ گوتوویەتی: ئافرەتێك هات بۆ لام دوو کچی خۆی لەگەڵ بوون، داوای خۆراکی لێ کردم، منیش هیچ شتێکم لە لا دەست نەکەوت جگە لە یەك دەنکە خورما، ئەو دەنکە خورمایەم پێ دا.ئەویش لێی وەرگرتم و دابەشی کرد لە نێوان دوو کچەکەو، خۆی هیچ شتێکی لێ نەخوارد. دوایی هەندێك وەستا و لەگەڵ دوو کچەکەی ڕۆیشتن. پاشان پێغەمبەر ﷺ هاتەوە لام، منیش ڕووداوەکەم بۆ باس کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك تاقیی بکرێتەوە بە دوو کچان، ئەویش لەگەڵیان چاکەکار بێ، ئەوە بۆی دەبنە بەربەست لە ئاگر و دەیپارێزن.

{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُوْلُ الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لَيْسَ أَحَدٌ مِنْ أُمَّتِي يَعُولُ ثَلاَثَ بَنَاتٍ، أَوْ ثَلاَثَ أَخَوَاتٍ، فَيُحْسِنُ إِلَيْهِنَّ، إِلاَّ كُنَّ لَهُ سِتْراً مِنَ النَّارِ»} حَدِيثٌ صَحِيحٌ[٢]

---

(١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٦٨٦٢))

(٢) (رَوَاهُ البَيْهَقِيُّ في (شعب): (١١٠٢٣)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (٥٣٧٢))

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێك نییە لە ئوممەتی من سێ کچ یان سێ خوشك بە خێو بکات، و، چاکەکار بێ لەگەڵیان، ئەوە بە دڵنیاییی بۆی دەبنە بەربەستێك و دەیپارێزن لە ئاگری دۆزەخ.

١)- {إِذَا صَلَّتْ الْمَرْأَةُ خَمْسَهَا، وَصَامَتْ شَهْرَهَا، وَحَفظَتْ فَرْجَهَا، وَأَطَاعَتْ زَوْجَهَا، قِيلَ لَهَا ادْخُلِي الْجَنَّةَ مِنْ أَيِّ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ شِئْت}[١]

واتە: ئەگەر ئافرەت پێنج نوێژە فەرزەکانی کرد و ڕۆژووەکانی مانگی ڕەمەزانی گرت و داوێنی خۆی لە (خراپەکردن) پاراست و، گوێڕایەڵیی پیاوەکەی کرد لە (کاری باش)، پێی دەگوترێ: بڕۆ بەهەشتەوە لە کام دەرگای بەهەشتەوە حەز دەکەی.

لە حەدیسی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە کە فەرموویەتی: {إِنَّمَا النِّسَاءُ شَقَائِقُ الرِّجَال}[٢] واتە: بێگومان ئافرەتان لەتکی پیاوانن، وەك چۆن سێوێك دەکەیتە دوو بەش و دوو لەتەوە، ئافرەت و پیاویش هەردووکیان خاوەنی یەك جۆرە نەفسن، وەك سێوێك کە لەتت کردبێ ئاوان.

---

(١) أخرجه ابن حبان برقم: (٤١٦٣)، قال شعيب الأرنؤوط: صحيح.

(٢) (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٦٢٣٨)، وَأَبُودَاوُدَ برقم: (٢٣٦)، وَالترِّمذِيُّ برقم: (١١٣)، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٢٨٦٣)).

## گفتوگۆیەکی ژیرانە لەگەڵ خوشکە ئازیز و بەڕێزەکانم

لە دەرەنجامی ڕاپرسییەک کە لەگەڵ کۆمەڵێك ئافرەتی باڵانەپۆش کە لە چین و ئاستی جیاوازدا بوون، پرسیاریان ئاڕاستە کرا. لە کۆی وەڵامەکانیان نۆ بیانوو بە دی دەکرا. بە پشتیوانیی خوای باڵادەست دەربارەی بیانووەکانی ئەوان گفتوگۆ دەکەین و لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەیانخەینە ڕوو:

**بیانووی یەکەم:** دەڵێت: هێشتا قەناعەتم بۆ دروست نەبووە بۆ ئەوەی ببمە باڵاپۆش!

ئێمە دەپرسین ئایا باوەڕت بە خوای گەورە و پەیامبەرکەی خوا و تەواوی ئایینی پیرۆزی ئیسلام هەیە وەك دوا ئایینی هەڵبژاردە لە ڕووی پرۆگرام و بەرنامە و مەنهەج و کەتەلۆگی ژیان، کە وەك ڕەحمەتێك بۆ گشت بەندەکانی خوای میهرەوان لەسەر زەویدا؟!

هەڵبەتە هەر خوشکێکی بەڕێز و ئازیز هەر لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا هەر زۆر بە خێرایی دەڵێت: (بەڵێ بەڵێ! ئەی چۆن من باوەڕی تەواوم بە (لا إله إلا الله محمد رسول الله) هەیە و، باوەڕی تەواوم بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هەیە وەك باشترین بیر و باوەڕ و عەقیدە و یاسا و ڕێسا و پرۆگرام و مەنهەجی ژیان...

دەی خوشکە ئەزیزەکەم! ئێمەش لە بەڕێزتان دەپرسین: لە سۆنگەی باوەڕبوونت بە خوای باڵادەست و پڕۆگرام و مەنهەج و تەشریعەکەی، دەبێت قەناعەتت بە فەرمانپێکراوەکان و قەدەغەکراوەکانی پەروەردگاری کارزان هەبێت/ئایا ئەم پرسیارەت لە خۆت نەکردووە: چۆن دەگونجێت و چۆن دەشێت باوەڕت بە خوای تاك و تەنیا هەبێت کە ئەو دروستکار و ڕۆزیدەری تۆیە، مردن و ژیانی تۆ لەژێر فەرمانی ئەودایە، کەچی ملکەچ و گوێڕایەڵ نەبیت بۆ فەرمانەکانی؟!

ئەوەتا پەروەردگاری کاربەجێ وەسفی کەسانی باوەڕدار دەکات و دەفەرموێت: (إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ) النور: ٥١

واتە: (بەڵام گوفتاری باوەڕداران کاتێك بانگ دەکرێن بۆ لای خوای باڵادەست و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) تا فەرمانڕەوایی بکات لە نێوانیاندا، تەنیا ئەوەیە کە دەڵێن: بیستمان و گوێڕایەڵین بۆ هەموو فەرمانێکی شەرع، ئا هەر ئەوانەش سەرفراز و سەرکەوتوون)[1].

دواجار خوشکی زێدە ئەزیزم: خۆت مەخەڵەتێنە، ئەگەر بە ڕاستی باوەڕداری ،ئەوەتا پەروەردگاری خاوەن بڕیار چوارچێوەی باوەڕدارانی دیاری کردووە، (إنَّما) بۆ حەصرە، واتە تەنیا و تەنیا ئەوانە باوەڕدارن کە بە حوکم و فەرمایشتەکانی خوای گەورە و

---

(١) - پوختەی تەفسیر

پەیامبەرەکەی ڕازین. دەی فەرمووە وەرە نێو بازنە و چوارچێوەی باوەڕداران، تا دەرفەتی ژیان و تەوبە و پەشیمانبوونەوەت لە دەست نەداوە، با تۆش یەکێك نەبیت لەو کەسانەی کە لە کاتی سەرەمەرگ بە داخ و ئاخ و حەسرەتەوە فرمێسکی پەشیمانی بڕێژیت. هەر وەك پەروەردگاری تۆڵەسێن لە هەواڵ و چارەنووسی ئەوان فەرموویەتی:
﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّىٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ۚ كَلَّآ ۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا ۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾
المؤمنون: ٩٩ - ١٠٠

واتە: (خوانەناسان بەردەوام لەسەر ڕێبازی چەوتیانن)، هەتا ئەو کاتەی مردن یەخەیان دەگرێت، ئەوسا هەر یەکەیان دەڵێت: پەروەردگارا! بمگێڕەوە بۆ دنیا، بەڵکوو چاکە بکەم و ئەو هەلانەی کە لە دەستم چوون، لەمەودوا لە دەستیانْ نەدەم، بەڵام تازە کار لە کار ترازاوە، شتی وا مەحاڵە، بۆیە بە توندی پێی دەگوترێت: نەخێر! ئەوە قسەیەکە ئەو بۆ خۆی دەیڵێت، بەڵکوو دەبێت لە جیهانی بەرزەخدا، لەنێوان مردن و زیندووبوونەوەدا چاوەڕوان بێت تا کاتێك زیندوو دەکرێتەوە.)[١]

بیانووی دووەم: دەڵێت من قەناعەتم بە باڵاپۆشی هەیە، بەڵام چی بکەم دایکم، باوکم، هاوسەرم، خوشکم، برام، هاوڕێکەم و... هتد، قەناعەتیان پێی نییە. چ بکەم دەسەڵاتم نییە و ناتوانم فەرمانی ئەوان بشکێنم، ئەوان دڵیان لێم دەڕەنجێت و منیش حەز ناکەم دڵیان

---

(١) - تەفسیری ئاسان

بڕەنجێنم!

ئێمە دەپرسین ئایا گوێڕایەڵیکردنی خوای گەورە و پەیامبەرەکەی (ﷺ) گرنگتر و پێویستترە یان گوێڕایەڵیی دایك و باوك و خوشك و برا؟! کامەیان دروستکار و سەرپەرشتیار و ڕزق و ڕۆزیدەری تۆن؟! مردن و ژیانی تۆیان بەدەستە؟! ئایا کامەیان لەپێشتر و بەرهەقترە بە گوێڕایەڵی و بێفەرمانی‌نەکردنی؟!

ئایا نەتبیستووە کە سەروەر و ئازیزمان فەرموویەتی: (لا طاعةَ لمخلوق في معصيةِ الخالق)[1] واتە: گوێڕایەڵیکردن بۆ هیچ دروستکراوێك نییە لە سەرکەشیکردنی فەرمانەکانی دروستکار کە پەروەردگاری تاك و تەنیایە.

تەنانەت دایك و باوك کە چاکەکردن و گوێڕایەڵیکردنیان ئەرك و پێویستییەکی شەرعییە، بەڵام بە مەرجێك لە بێفەرمانیکردنی پەروەردگاری باڵادەستی نەبێت، چونکە ماف و فەرمانی خوای گەورە لە سەرووی گشت ماف و فەرمانێکە، وەك پەروەردگاری کاربەجێ فەرموویەتی: (وَإِن جَاهَدَاكَ عَلَى أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلا تُطِعْهُمَا) لقمان: ١٥

واتە: ئەگەر (باوك و دایکت) ئەوپەڕی هەوڵیان دا لەگەڵت بۆ ئەوەی شتێك بکەیت بە هاوبەشی من کە هیچ زانیارییەکت پێی

---

(١) -الراوي: النواس بن سمعان الأنصاري ا المحدث: الألباني ا المصدر: تخريج مشكاة المصابيح ا الصفحة أو الرقم : ٣٦٢٤ ا خلاصة حكم المحدث: صحيح ا التخريج: أخرجه البغوي في ((شرح السنة)) (٢٤٥٥(

نییە، ئەوا گوێڕایەڵییان مەکە.[١]

زانایانی شەرعناس فەرموویانە: ئەگەرچی خوای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا تەنیا باسی هاوەڵ و هاوبەشدۆزینەوەی کردووە، بەڵام گشت گوناهێکی گەورە و بچووك دەگرێتەوە؛ لێ ئەمە نابێت ڕێگر بێت لە چاکەکردن لە گەڵیان، (وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفاً) واتە: لە دونیادا زۆر بە چاکی هاوڕێیەتییان بکە و چاکەیان دەگەڵ بکە.

دواجار دەڵێین: چۆن گوێڕایەڵی دایکت، باوکت، هاوسەرت، خوشکت، برات، هاوڕێت و...هتد، دەبیت و سەرکەشی لە فەرمانی پەروەردگاری باڵادەست دەکەیت؟! لە کاتێکدا پەروەردگار تۆ و ئەوانیشی دروست کردووە و دونیا و دوارۆژی تۆ و ئەوانیش لەژێر دەسەڵات و فەرمانی بەرزی ئەودایە؟! ئایا ئەوان دەتوانن لە مردن ڕزگارت بکەن، یاخود تەنانەت یەك سەعات مردنت دوا بخەن و ژیانت بۆ درێژ بکەنەوە؟! ئەی دەتوانن لە ئازاری نێو گۆڕ و سەختیی ڕۆژی دوایی و سزای دۆزەخ بتپارێزن؟!

هەڵبەتە نەك بۆ تۆ، تەنانەت بۆ خۆشیان هیچیان پێ ناکرێت! دەی کە وا بێت، لەپێناو بەختەوەری و سەرفرازیی هەردوو دونیات، ئەم فەرمانەی پەروەردگاری باڵادەست جێبەجێ بکە کە فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَوَلَّوۡاْ عَنۡهُ وَأَنتُمۡ تَسۡمَعُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾ الأنفال: ٢٠ واتە: ئەی ئەو کەسانەی

---

(١) - پوختەی تەفسیر

بڕواتان هێناوە، گوێڕایەڵی خوای بێوێنە و پێغەمبەرەکەی بن(ﷺ) و پشتیان تێ مەکەن، لە کاتێکدا ئێوە تێدەگەن و دەبیستن!)[١]

نا نا نەکەی ئامان! خۆت تووشی و تووڕەییی پەروەردگاری بالادەست نەکەیت! باوەڕدارێکی وریا و هۆشیار بە، نەکەویتە نێو کۆمەڵەی ئەم جۆرە کەسانە، کە خوای خاوەن بەدەسەڵات هەڕەشەی لێ کردوون و دەربارەیان فەرموویەتی:﴿ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿٢١﴾ ۞ إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلْبُكْمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾الأنفال: ٢١ – ٢٢

واتە: وەکوو ئەوانە مەبن کە (بە سەرزارەکی) گوتیان: بیستمان، لە کاتێکدا کە ئەوانە هیچ نابیستن و تێناگەن، بەڕاستی خراپترینی هەموو گیانلەبەران لە لای خوای گەورە، ئەو کەڕولاڵانەن کە بیر ناکەنەوە و ژیر نابن)[٢].

**بیانووی سێیەم:** دەڵێت: خۆ بە بالاپۆشی نییە! من زۆر لە بالاپۆشەکان باشترم. زۆرێك لەوان ئافرەتی خراپن، من دڵم ساف و بێگەردە! خوای گەورەش سەیری دڵەکان دەکات نەك ڕواڵەت.

ئێمەش دەڵێین: خۆشکە ئازیزەکەم، چۆن بە بالاپۆشی نییە؟! بالاپۆشی تاج و ناسنامەی ئافرەتی باوەڕدارە. ئەو خوایە تاك و تەنیایەی کە تۆ باوەڕت بە کاربەجێیی و کارزانی و لێزانی و

---

(١) - پوختەی تەفسیر

(٢)- پوختەی تفسیر

زانایيى ئەو هەيە، دەی ئەوە پەروەردگاری مەزنە بالاپۆشی لەسەر تۆ فەرز و پێوست کردووە و، ئەو بڕیاری بالاپۆشی بۆ تۆ داوە/ گەر تۆش خۆت بە باوەڕدار دەزانیت، دەبێت گوێڕایەڵ و ملکەچی فەرمان و بڕیارە بەرز و جوان و پڕ لە داناییيەکەی ئەو بیت/ تۆ واز بهێنە لە بالاپۆشە خراپەکان، ئەوان پێشەنگ و سەرمەشقی تۆ نین و گوناهی خۆیان بۆ خۆیانە.

ئینجا وێدەچێت تۆ لەخەوی غەفلەت و بێئاگاییدا بیت! چۆن کەسێك سەرکەشی بکا لە فەرمانی خوای بالادەست و پەیامبەرەکەی (ﷺ)، دڵی بە سافی دەمێنێتەوە؟!

ئایا سەرگوزەشتەی باوە ئادەم و دایە حوات نەبیستووە؟! ئەگەرچی پەروەردگاری لەکارزان باوە ئادەمی بە دەستەکانی خۆی دروست کرد و فەرمانی بە فریشتەکان کرد کڕنووشی ڕێزی بۆ بەرن و ئەوانی خستە نێو خۆشیی بەرفراوانی بەهشت ە هەرچی ڕێز و بەختەوەری بوو بۆیانی فەراهەم کرد، کەچی کاتێك کە بەڵێنی نێوان خۆیان و پەروەردگاریان لە یاد چوو و لەم دارەیان خوارد کە خوای کاربەجێ لێیانی قەدەغە کردبوو، جل و بەرگیان لە بەر بوویەوە و لە شەرمان ڕایاندەکرد و خۆیان بە گەڵای دارەکانی بەهەشت دادەپۆشی. دواجار بە گریان و پاڕانەوە و پەشیمانی و داوای لێخۆشبوونی زۆرەوە گەڕانەوە لای خوا. ئەگەرچی پەروەردگاری بەبەزەیی لێیان خۆش بوو، بەڵام پێی گوتن: (اهبطوا) دابەزن بۆ سەر زەوی! ئاشکرایە کە ژیانی

سەرزەوی ئازار و نەخۆشی و ناخۆشی و مەینەتی و ماندووبوون و هیلاکیی زۆری تێدایە.

جا خوشکە ئازیزەکەم سەرنج بدە و بزانە کاتێك باوکە ئادەم سەرکەشی و لادانی کرد لە فەرمانی خوای گەورە، ئەگەرچی تاکە گوناهـ بوو و یەکەم جاریش بوو، بەڵام پەروەردگاری دادگەر چاوپۆشیی لێ نەکرد و نەیفەرموو (دڵی سافە)! بەڵکوو بەم شێوازە گوزارشت لە باسوخواس و سەرەنجام و چیرۆکی ئەوانمان بۆ دەکات و دەفەرمووێت: ﴿ فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْءَاتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ ۚ وَعَصَىٰ آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ثُمَّ اجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ ﴿١٢٢﴾ قَالَ اهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًا ۖ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ ﴾ طه: ١٢١ - ١٢٣

واتە:ئینجا هەردووکیان لە بەروبوومی درەختە قەدەغەکراوەکەیان خوارد و بەو هۆیەوە (جل و بەرگیان داماڵرا). ئیتر عەیب و عەورەتیان دەرکەوت و، دەستیان کرد بە داپۆشینی لەشیان بە گەڵای درەختەکانی بەهەشت. ئادەم سەرپێچی فەرمانی پەروەردگاری کرد، ئیتر لە ڕێگای ڕاست لای دا. پاشان پەروەردگار هەڵیبژارد (بۆ پێغەمبەرایەتی) و تەوبەی لێ قەبووڵ کرد و ڕێنموونی کرد، خوای گەورە فەرمووی هەردووکتان بڕۆنە خوارەوە و لەوێ پێکەوە (نەوەکانتان) دەبنە دژمنی یەکتری. جا ئەگەر پەیامتان بۆ هات

لە لایەن منەوە، ئەوسا ئەوەی شوێنی ڕێنموونیی من بکەوێ، ئەو (لە دنیادا) گومڕا نابێ و (لە ڕۆژی دواییدا) تووشی ناخۆشی و زەحمەتی نابێ)[1].

**خوشکە بەڕێز و سەنگینەکەم:**

خوای گەورە لە سەرووی حەوت ئاسمان و عەرشی بەرز و مەزنی خۆی، دەوڵەمەند و بێنیازە و پێویستی بە خواپەرستی و بالاپۆشیی من و تۆ نییە، بەڵکوو ئێمە پێویستمان بە خواپەرستی و گوێڕایەڵی و بالاپۆشییە. بزانە خوای گەورە موجامەلە لەگەڵ هیچ کەسێك ناکات، مامەڵەی پەروەردگاری دادگەر و میهرەبان لەگەڵ هەر بەندەیەك بەپێی ملکەچی و گوێڕایەڵی و سەرکەشی و گوناهـ و تاوانەکانیەتی، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ ﴾ طه: ١٢٤

واتە: (ئەوەشی ڕوو وەربگێڕێت لە بەرنامە و یادی من و پشتی تێ بکات، بێگومان ئەو جۆرە کەسە ژیانێکی ترش و تاڵ و ناخۆشی بۆ پێش دێت، لە ڕۆژی دواییشدا بە کوێری حەشری دەکەین.)[2]

**بیانووی چوارەم:** دەڵێن ئاووهەوا زۆر گەرمە، من ناتوام بالاپۆش بم، دەسووتێم لە گەرمان!

**خوشکی ئازیز:** پەروەردگاری بیسەر وەڵامی ئەم بیانووەی تۆی

---

(١) پوختەی تەفسیر
(٢) - تەفسیری ئاسان

داوەتەوە و فەرموویەتی: ﴿قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَّوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ ۝٨١﴾ التوبة: ٨١

واتە: (ئەی پەیامبەری خوا (ﷺ) پێیان بڵێ: ئاگری دۆزەخ زۆر گەرمترە (لەم گەرمایە) ئەگەر ئەوانە تێبگەن و ژیر بن.)[١]

بە ڕاستی سەیرە چۆن گەرمای دنیا لەگەڵ ئاگری دۆزەخ بەراورد دەکرێت؟! دیارە خوشکانێك کەوتوونەتە نێو داو و فێڵ و تەڵەکەی شەیتانی نەفرەتلێکراو. بزانە کە وا شەیتان دژمنی تۆیە و هەمیشە لە فێڵ و پیلاندایە بۆ ئەوەی بە هۆی ترساندنت بە گەرمای دنیا، گیرۆدەی ئاگری دۆزەخت بکات! نەکەی! نا نا نەکەیت ئەوەندە لاواز و سادە و ناژیر بیت، شەیتان بە بەڵێن و وەسوەسەکانی فریوت بدات. بزانە خۆڕاهێنان لەسەر باڵاپۆشی لە توانای گشت ئافرەتێکدایە. دڵنیا بە ئەگەر لە توانای گشت ئافرەتێك نەبووایە، هەرگیز پەروەردگاری زانا و کاربەجێ و کارزان و میهرەبان باڵاپۆشیی لەسەر ئافرەتان پێویست و فەرز نەدەکرد. هەڵبەتە پەروەردگاری کارزان یارمەتیدەرت دەبێت. بشزانە ئاگری دۆزەخ چەندەها جار لە گەرمای ڕۆژ گەرمترە، بەس بە هەڵم و هاڵاوەکەی پێستی دەم و چاو و ڕووت دەهێنێتە خوار.

**بیانووی پێنجەم:** دەڵێ دەترسم ببم بە باڵاپۆش، دواتر وەك زۆرێك لە ئافرەتان حیجابەکەم فڕێ بدەم و واز لە باڵاپۆشی بێنم!

ئێمەش دەڵێین: جا ئەگەر گشت موسڵمانان بە شێواز و

---

(١) پوختەی تەفسیر

لۆجیکی تۆ بیر بکەنەوە، ئەوا دەبێت هیچ موسڵمانێك دەست نەکات بە نوێژکردن و ڕۆژووگرتن و پێوەستبوون بە قورئان و سوننەت، ئینجا واز لە سەرجەم خواپەرستییەك بهێنێت. دیارە ئیبلیسی نەفرەتلێکراو سەرکەوتوو بووە لە پیلان و فێڵ و تەڵەکەکانی، توانیویەتی بە کۆمەڵێك وەهم و خەیاڵی نادروست و ناڕاست لە لە هیدایەت و ڕێی ڕاست بێبەشت بکات.

هەڵبەتە خوای میهرەبان پێی خۆشە بەندەکانی لە خواپەرستی و گوێڕایەڵی و ملکەچی بەردەوام بن، ئەگەر سوننەت و موستەحەبیش بێت، چ جای بۆ فەرز و واجبەکان! هەروەك سەروەر و ئازیزمان (ﷺ) فەرموویەتی: (أَحَبُّ الأعمالِ إلى اللهِ أدْوَمُها و إن قَلَّ.)[1] واتە: خۆشەویستترین کردەوە لای خوای گەورە بەردەوامبوونە لە ئەنجامدانی، ئەگەر کەمیش بێت.

جا لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە، ئایا بۆچی تۆ بەدواداچوون لە هۆکاری وازهێنانی ئەوان لە بالاپۆشی ناکەیت؟ بۆ ئەوەی بەهرەمەند بیت لە ئەزموونی ئەوان، ئەوسا بەرچاوڕوون و وریا دەبی و ئاوا بە سانایی ناکەویتە نێو بازنەی فێڵ و پیلان و تەڵەکەی شەیتانی نەفرەتلێکراو.

ئەی بۆچی پرسیار لە کەسانی شەرعناس ناکەیت بۆ ئەوەی

---

(١) -الراوي: عائشة أم المؤمنين | المحدث: الألباني | المصدر: صحيح الجامع | الصفحة أو الرقم: ١٦٣ | خلاصة حكم المحدث: صحيح | التخريج: أخرجه البخاري (٦٤٦٥)، ومسلم (٧٨٣) واللفظ له.

ڕێنماییت بکەن بۆ هۆکارەکانی دامەزران و پێوەستبوون بە شەرع و بەرنامەی خوای باڵادەستەوە، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا۟ مَا يُوعَظُونَ بِهِۦ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ﴿٦٦﴾ ﴾ النساء: ٦٦

واتە: (ئەگەر بە ڕاستی ئەوان کاریان کردبا بەپێی ئەو ئامۆژگارییانەی دەکران و دەستیان گرتبا بە هۆکارەکانی ڕێنماییبوون، ئەوسا تام و چێژی باوەڕیان دەچێژت. هەڵبەتە ئەوە باشتر بوو بۆیان و دامەزراوتر دەبوون لەسەر ئایینەکەیان.)[١]

**بیانووی شەشەم: پێم دەڵێن ئەگەر باڵاپۆش بیت، هیچ گەنجێك ناتخوازێت! بۆیە بڕیارم داوە دوای پڕۆسەی هاوسەرگری باڵاپۆش بــــم!**

خوشکە بەڕێز و سەنگینەکەم: ئێمە دەپرسین ئایا گەنجێك بە سفووری و خۆدەرخستن و سەرکەشیکردن لە فەرمانی پەروەردگاری کارزان و پەیامبەرەکەی تۆی دەوێت؟! ئایا پیاوێك دەکەیتە هاوسەری خۆت غیرەتی لە بەرانبەر قەدەغەکراوەکانی خوای گەورە و لەسەر تۆ نەبێت؟! ئەگەر تۆ ئافرەتێکی باوەڕداریت، پێویستە ئەو جۆرە گەنجانە بە شایانی خۆت نەزانیت. ئینجا هاوسەرێك پاڵپشتت نەبێت بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوای باڵادەست و چوونت بۆ بەهەشت و ڕزگاربوونت لە دۆزەخ،

---

(١) - تەفسیری ئاسان

پێم بڵێ چۆن دڵخۆش و بەختەوەر و ئارام دەبیت؟! دڵنیا بە هەر ماڵێك لە سەر بناغەی لادان و گوناهـ و تاوان و سەرکەشی و تووڕەیی پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات و پەیامبەرەکەی (ﷺ) بنیاد نرا، ئەوا پەروەردگاری مەزن بڕیاری بەدبەختی و نائارامی و ژیانێکی تەنگ و ناخۆشی بۆ داون لە دونیا، لە دوارِۆژیش سزایێکی سەختیان بۆ هەیە، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ ﴾ النور: ٦٣ واتە: (دە با ئەوانەی کە سەرپێچی لە فەرمانی پێغەمبەری خوای باڵادەست دەکەن، بترسن لەوەی کە تووشی تاقیکردنەوەیەکی سەخت، یان تووشی سزایەکی بەئێش ببن.

هەڵبەتە پرۆسەی هاوسەرگری نیعمەتێکە و پێویستی بە سپاسگوازرییە، سپاسگوازاریی ئەم نیعمەتەش، بریتییە لە ملکەچبوون بۆ فەرمایشتەکانی پەروەردگاری کاربەجێ. دیارە سپاسگوزاری کار و هەنگاوەکان پڕ لە خێر و بەرەکەت دەکات. ئینجا بزانە، سوێند بە خوای مەزن! هاوسەرگرییەك سەرەتاکەی بە سەرکەشی و فەرمانشکێنی دەست پێ بکات، بێگومان خێر و بەرەکەتی بە دواوە نابێت.

دواجار پێت دەڵێم خوشکی ئەزیزم، ئەوانەی باڵاپۆشن، زۆر زیاتر لە باڵانەپۆشەکان خوازبێنییان بۆ دێت، تەنانەت ئەوانەی بەرچاو و جوان نین، پەروەردگاری باڵادەست بێبەشی نەکردوون لە نیعمەتی هاوسەرگری، بە هۆی گوێڕایەڵی و ملکەچییان بۆ

فەرمایشتەکانی پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات.

**بیانووی هەشتەم:** دەڵێت دەزانم باڵاپۆشی واجبێکی شەرعییە، بەڵام کەی خوای گەورە ڕێنوێنیی کردم و هیدایەتی دام، ئەوسا دەبم بە باڵاپۆش..

خوشکە بەڕێزەکەم: خوای کارزان بۆ هەموو شتێك هۆکار و سەبەبی داناوە، تۆ هەنگاو بنێ بەرەو پەروەردگاری میهرەبان و هەوڵ بدە و تێ بکۆشە، دڵنیا بە خوای گەورەش ڕێنوێنیت دەکات و هیدایەت دەدات، ئەوە بەڵێنی خوای باڵادەستە بۆ بەندەکانی، هەروەك فەرموویەتی:﴿ وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ ﴿٦٩﴾ ﴾ العنكبوت: ٦٩

واتە: ئەوانەش لە پێناوی ئێمەدا و بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی ئێمە هەوڵ و کۆششیان کردووە و خۆیان ماندوو کردووە، سوێند بەخوا بە ڕاستی ئەوانە ڕێنوێنی دەکەین بۆ هەموو ڕێگایەکی چاك و دروستی خۆمان، (کە بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی ئێمەی لە دوایە)، بێگومان خوای مەزن هەمیشە لەگەڵ چاکەکارانە.)[١]

جا خوشکەکەم، ئەگەر ڕێنوێنی و هیدایەتت گەرەکە، ئەوا هۆکارەکان بگرە بەر و هەنگاویان بۆ بنێ.

**بیانووی نۆیەم:** دەڵێت من هێشا بچووکم و کاتم لە بەردەمە، با تۆزێك گەورەتر بم، ئەوسا تۆبەیێك دەکەم و بڕیاری باڵاپۆشی دەدەم!

---

(١) - پوختەی تەفسیر

ئێمەش دەڵێین: خوشکە ژیرەکەم! کاتێك فریشتەی گیانکێشان دێت، چاوەڕوانی خۆئامادەکردن و ڕازیبوونی تۆ ناکات! دڵنیا بە تەنانەت یەك کاتژمێریش مۆڵەتت پێ نادات، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾ الأعراف: ٣٤ واتە: وە بۆ هەموو ئوممەتێك کاتێکی دیاریکراو هەیە (بۆ مردن و سزادانیان)، ئینجا کاتێ ماوەی (مردن یا سزا)کەیان هات، ساتێك دوا ناکەون و ساتێکیش پێش ناکەون.)[1]

ئینجا مردن بچووکی و گەنجی و گەورەیی و پیری نازانێت. ئەی چی دەکەیت ئەگەر لەسەر ئەم گوناهـ و سەرکەشییە گیان بسپێریت؟! دڵنیا بە ئەوسا پەنجەی پەشیمانی دەگەزیت و دەڵێیت خۆزگە کاری چاکەم پێش خۆم خستبایە، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ يَقُولُ يَالَيْتَنِي قَدَّمْتُ لِحَيَاتِي ﴿٢٤﴾ ﴾ الفجر: ٢٤

واتە: ( ئینجا بە داخ و حەسرەتەوە دەڵێت: خۆزگە لە دونیا کاری چاکم پێش بخستبایە بۆ ئەم ژیانەم.)[2]

---

(١) - پوختەی تەفسیر

(٢) - پوختەی تەفسیر

## نائومێد مەبە لە بەزەیی و میهرەبانی و لێخۆشبوونی پەروەردگارت

خوشکە بەڕێزەکەم: ئەگەر هەست دەکەیت گوناهی زۆریشت کردووە، هەر نائومێد مەبە لە بەزەیی و لێخۆشبوونی پەروەردگارت. ئەوەتا خوای میهرەبان ئەو کەسانە دەدوێنێ کە زێدەڕۆییان کردووە لە کردنی گوناهـ و تاوان، پێیان دەفەرمووێ: ﴿ قُلْ يَـٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ الزمر، واتە: (ئەی ئەو بەندانەی من! کە زێدەڕۆییتان کردووە لە کردنی تاوان، لە بەزەیی خوا بێئومێد مەبن، خوای بەزەیی بە تەئکید لە گشت تاوانەکانتان خۆش دەبێ، چونکە هەر ئەو لێخۆشبوو و میهرەبانە.)[1]

ئەگەر بە وردی سەرنج لەم ئایەتە پیرۆزە بدەین، دەبینین خوای پەروەردگار هێشتا ئەو بەندە خراپانەی کە خەریکی تاوان و سەرکەشیکردنن، لە بازنەی بەندایەتیی خۆی دەری نەکردوون، بەوپەڕی شیرینی و ئومێدبەخشینەوە پێیان دەفەرمووێ: (يَـٰعِبَادِىَ) ئەی بەندەکانم!!

ئیبنو مەسعوود (خوای گەورە لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هەر کاتێك باوەڕدار گوێی لە ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴿١٠٤﴾ ﴾ بوو، پێویستە

---

(١) - تەفسیری ڕێبەر

بە وردی گوێی خۆی هەڵخا، چونکە ئەوە خوای گەورە بە تایبەت بانگی ئەو دەکات، پەروەردگاری کارزان دەیەوێ فەرمانێکت ئاراستە بکات، یان شتێکت لێ قەدەغە بکات.

جا دیارە مرۆڤ بە سروستی خۆی کورتبینە و، هەموو شتەکان لە ڕواڵەتدا دەبینێ و ناوەڕۆکەکەی نابینێ، شتەکانی ئەمڕۆ دەبینێ، بەڵام هیی بەیانی نابینێ.

خوای پەروەردگار باوەڕداران بە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴿١٠٤﴾ ﴾ بانگ دەکات، ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە. ئیمانەکە هۆکاری ئەو تەکلیفەیە کە خوای باڵادەست لە باوەڕدارانی دەکات، بەڵام بێبڕوایان و ستەمکاران و دووڕووان، شایانی ئەوە نین خوای پەروەردگار شتیان پێ بسپێرێ و تەکلیفیان لێ بکات. دیارە خوای پەروەردگار کلیلی قەبووڵبوونی کار و کردەوەکانی دیکەی بەستووەتەوە بە گەڕانەوە (تەوبە) بۆ لای خۆی. با لەو بارەوە چەند دەقێك بە نموونە بهێنینەوە:

١)- دەربارەی تەوبە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەفەرمووێ: {التَّائِبُ مِنْ الذَّنْبِ كَمَنْ لَا ذَنْبَ لَهُ.}[١]

ئەو کەسەی تەوبە دەکات لە گوناهەکانی، وەك ئەوە وایە هیچ گوناهێکی نەکردبێ. کەواتە: شایەنی ئەوە دەبێ بە دڵێکی پاك و هەست و شعوورێکی پڕ لە چاکە، دەست بە ئەنجامدانی کردەوە

---

(١) أخرجه ابن ماجه (١٤١٩/٢، رقم ٤٢٥٠)، والطبراني (١٥٠/١٠، رقم ١٠٢٨١).

چاکەکان بکات، بۆ ئەوەی بە دوو باڵەوە بفڕێ و، بە ڕۆح و گیان بچێتە خزمەت خوای بێوێنە.

٢)- هەروەها خوای (تبارك وتعالى) دەفەرمووێ: ﴿ٱلتَّـٰٓئِبُونَ ٱلْعَـٰبِدُونَ ٱلْحَـٰمِدُونَ ٱلسَّـٰٓئِحُونَ ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّـٰجِدُونَ ٱلْـَٔامِرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱلْحَـٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٢﴾﴾ التوبة، واتە: (ئەو بڕوادارانە کە خوای گەورە ئەو کڕین و فرۆشتنەی لەگەڵ کردوون، ئەمانەن وەکوو خۆی دەفەرمووێ: لە ڕابردووی خراپی خۆیان پەشیمانن، عابید و خواپەرستن، شوکرانەبژێر و سپاسگوزارن و ڕۆژووگر و جیهادکارن، ڕکووعبەر و کڕنووشبەرن، (الآمرون بالمعروف) فەرمان دەرن بە چاکە و (الناهون عن المنكر) ڕێگرن لە خراپە و پارێزەرن بۆ سنوورەکانی خوا.. ئەمانەن لەگەڵ خوادا مامەڵەی بەهەشتیان کردووە و بەهەشتین. دەسا تۆش -ئەی موحەممەد!- ئەو مزگێنییە بدە بەو باوەڕدارانە.)[1]

خوشکە بەڕێزەکەم: ئەگەر سەیری ئایەتەکە بکەیت، ئەو هەموو کردەوە چاکەی کە لە دوای یەك هاتوون و خوای پەروەردگار ستایشی کردوون، بە چی دەستی پێ کردووە؟ بە {ٱلتَّـٰٓئِبُونَ} ئەو کەسانەی کە تەوبە دەکەن. کە وا بوو، کلیلی قەبووڵبوونی کار و کردەوە چاکەکان بریتییە لە: تەوبەکردن و گەڕانەوە و وازهێنان لە گوناهـ و و تاوان و سەرکەشی.

---

(١) - تەفسیری رامان

٣)- هەروەها لە ئایەتێکی دیکە فەرموویەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ تُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا ﴿٨﴾ ﴾ التحريم، واتە: (ئەی باوەڕداران، تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە لای خوای بەبەزەیی؛ تەوبەیەکی پوخت و جوان و تۆکمە.)[1]

دەی تۆش خێراکە تەوبەیەکی پوخت و جوان و ڕاستەقینە بکە، بۆ ئەوەی تۆش یەکێك بیت لە سەرفراز و ڕزگاربووەکانی ڕۆژی دوایی. خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَتُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾ ﴾ النور، واتە: (ئەی باوەڕداران! ئێوە گشتتان بگەڕێنەوە لای خوای گەورە و تەوبە بکەن، بۆ ئەوەی سەرفراز و سەرکەوتوو بن.)[2]

ئەی باوەڕداران، ئێوە هەمووتان بگەڕێنەوە لای خوای گەورە، کەس لەم تەوبەکردنە پاشەکشە نەکات، بڕۆن بۆ لای خوا، ﴿ فَفِرُّوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۖ إِنِّى لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ ﴾ الذاريات، دەی بە پەلە بڕۆن بۆ لای خوای گەورە، من ترسێنەر و ئاگادارکەرەوەیەکی ئاشکرام بۆ ئێوە.[3]

٤)- لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرمووێ: ﴿ وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُوا۟ مَيْلًا عَظِيمًا ﴿٢٧﴾ ﴾

---

(١) - پوختەی تەفسیر

(٢) - تەفسیری ئاسان

(٣) - تەفسیری ڕامان

النساء، واتە: (خوای باڵادەست دەیەوێ لێتان خۆش بێ، بەڵام ئەو کەسانەی بە شوێن هەوا و ئارەزووەکانی خۆیان دەکەون، دەیانەوێ لە ڕێگەی حەق و ڕاست لاتان بدەن، بە لادانێکی گەورە.)[1]

٥)- هەروەها دەفەرمووێ: ﴿ أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٧٤﴾ ﴾ المائدة، ئایا ئێوە ناتانەوێ تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوای پەروەردگار؟! ( أَفَلَا ) لە زمانی عەرەبیدا پرسیارکردنی سەرزەنشتکردنە، (الإستفهام الإنكار). ئەم جۆرە پرسیارکردنەش بۆ دوو مەبەستە: (التوبيخ، والتقريع)، سەرزەنشتکردن و بەئاگاهێنانەوە، ئایا بەس نییە کە واز ناهێنن لە گوناهـ و تاوانەکانتان؟!

دەی خوشکە ئازیزەکەم ئەوە پەروەردگاری خاوەن دەسەڵاتە پرسیارت لێ دەکات بە شێوەیێك سەرزەنشتت دەکات بۆ ئەوەی بە ئاگا بێیتەوە، واز بهێنیت لە شوێنکەوتنی حەز و ئارەزووەکانت و گوێڕایەڵیکردنی شەیتان. جا ئەگەر باوەڕداریت، پێویستە ئەو ئایەتە درووشمت بێت: ﴿ وَقَالَ إِنِّى ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّى سَيَهْدِينِ ﴿٩٩﴾ ﴾ الصافات واتە: (ئیتر من دەچم بۆ لای خوای کاربەجێ، ئەو ڕێنموییم دەکات.)[2]

نا نا نەکەی یەکێك بیت لە دەرچووانن لە فەرمایشتەکانی

---

(١) - پوختەی تەفسیر

(٢) - تەفسیری ئاسان

پەروەرگاری کارزان، دەنا بێبەش دەبیت لە هیدایەت و ڕێنوێنی. خوای بەرز و بڵند دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ ﴿١٠٨﴾﴾ المائدة، (خوای گەورە هەرگیز ڕێنوێنیی کەسانێك ناكات، کە لە گوێڕایەڵیی ئەو دەربچن.)[1]

خوشکە گران و سەنگینەکەم: تۆ وا مەزانە خوای کاربەجێ هەر وا تۆی دروست کردووە، پێوستە ژیرانە بیر بکەیتەوە و بزانیت کە خوای کارزان بۆ پەرستن و گوێڕایەڵی و ملکەچبوون بۆ فەرمانەکەی خۆی ئێمەی دروست کردووە، هەروەك فەرموویەتی: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾﴾ المؤمنون، ئایا ئێوە وا دەزانن (خوای مەزن) ئێوەی بە گاڵتە دروست کردووە، ناگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە؟!)[2]

ئیتر با نائومێد نەبین لە ڕەحمەت و بەزەیی و لێخۆشبوونی پەروەردگاری باڵادەست، چونکە تەوبە و گەڕانەوە پەتی ڕزگاربوونە، وەک کەشتییەکەی نووحە بۆ ڕزگاربوونی ئێمە بەرەو کەناری ئارامی.

پاداشتی ئەو کەسانەی کە دەگەڕێنەوە لای خوای باڵادەست و تەوبە دەکەن:

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا تُوبُوا إِلَى اللَّهِ

---

(١) - پوختەی تەفسیر

(٢) - تەفسیری ئاسان

تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ يَوْمَ لَا يُخْزِى ٱللَّهُ ٱلنَّبِىَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ ۖ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَٱغْفِرْ لَنَآ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٨﴾ ﴾ التحريم.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، تەوبەیەکی ڕاستەقینە بکەن! نزیکە کە خوای گەورە هەموو گوناهەکانتان بسڕێتەوە، بتانخاتە بەهەشتێك کە لە ژێرییەوە جۆبار دەڕوا. ئەو ڕۆژەی کە خوای باڵادەست و پێغەمبەر و (ﷺ) ئەو باوەڕدارانەی کە لەگەڵیدا بوون، تووشی خەجاڵەتیان ناکات، بەڵکوو خوای گەورە ڕووناکییەکی وایان دەداتێ لەپێشیانەوە و لە دوایانەوە، ئەوانیش دەڵێن: پەروەردگارمان! ئەو نوور و ڕووناکییەمان بۆ تەواو بکە و لێمان خۆش ببە، تۆ توانات بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.)[1]

**ئایا گوناهەکان لە چ حاڵەتێکدا لەسەر ئادەمیزاد نانووسرێن؟**

لەو بارەوە پێغەمبەری خوای باڵادەست(ﷺ) فەرموویەتی: {إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ وَالنِّسْيَانَ وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ}[2].

لە سێ حاڵەتدا خوای گەورە چاوپۆشیی کردووە لە ئوممەتەکەم:

---

(١) تەفسیری ئاسان

(٢) أخرجه مسلم (١٩٩٤/٤، رقم ٢٥٧٧)، وابن حبان (٣٨٥/٢، رقم ٦١٩)، والحاكم (٢٦٩/٤، رقم ٧٦٠٦)، وقال: صحيح على شرط الشيخين.

**یەك:** (الْخَطَأَ)، حاڵەتی بە هەڵە کردنی تاوانێك، کە نەیزانیبێ تاوانە و بە عەمدەن نەیکردبێ.

**دووەم:** (النِّسْيَانَ)، لەحاڵەتی لەبیرچوونەوە.

**سێ:** (مَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْه)، لە حاڵەتی تۆبزیلێکران، مرۆڤ کاتێك تۆبزیی لێ دەکرێ بۆ کردنی تاوانێك، ئەگەر بزانێ مەترسی لەسەر ژیانی دروست دەبێ و لەناو دەبرێ، دەتوانێ تاوانەکە بکات و خوای گەورە هیچی لەسەر نانووسێ.

**پەلە کردن لە تەوبەکردن:**

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە فەرمایشتێکی قودسیدا لە خوای گەورەوە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێ: {فَاسْتَغْفِرُونِي أَغْفِرْ لَكُمْ} واتە: زوو داوای لێخۆشبوونم لێ بکەن من لێتان خۆش دەبم.

کە نەزەرێك، یان غەیبەتیك، یان فەرمانێکی خوا دەشکێنی، مەهێڵە درەنگ بکەوێ، ڕاستەوخۆ تەوبە و ئیستغفار بکە، چونکە تۆ نازانی کەی دەمریت. جگە لەوەش، ئەگەر زوو تەوبە نەکەی، فریشتەکان لەسەرت دەنووسن و لای خوا لێپێچینەوەت لەگەڵ دەکرێت.

ئەوەتا خوای گەورە حاڵی ئەو کەسانەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە زوو تەوبە ناکەن، تا دەکەونە سەرەمەرگ، دەفەرمووێ: ﴿ وَلَيْسَتِ ٱلتَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ إِنِّي تُبْتُ ٱلْـَٔـٰنَ ﴿١٨﴾ ﴾ النساء، واتە: تەوبە بۆ ئەو کەسانە نییە کە

بەردەوامن لە کردنی گوناهـ و تاوان، تا دەگاتە سەرەمەرگ، ئینجا دەڵێ: ئێستا من تەوبە دەکەم.)[١]

ئەی با بزانین تەوبە بۆ کێیە؟ بە دڵنیاییەوە بۆ ئەو کەسانەیە کە زوو تەوبە دەکەن و پەشیمان دەبنەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلتَّوْبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٧﴾ ﴾ النساء، ( إِنَّمَا ) لە زمانی عەرەبیدا ئەداتی (حصر)ـە، واتە: تەنیا تەوبە بۆ ئەو کەسانەیە کە خراپەکارییان کردووە بە نەزانی، پاشان زوو دەگەڕێنەوە بۆ لای خوای خاوەن دەسەڵات، بە ڕاستی ئەوانەن کە خوای گەورە تەوبەکانیان لێ وەردەگرێ، بە ڕاستی خوا زانای کاربەجێیە)[٢]

بەردەوامبوون لەسەر تاوان واتە: یاخیبوون، ئەو یاخیبوونەش دڵ و ناخی ئادەمیزاد ڕەش دەکات.

دوای تەوبەکردنیش خوای پەروەردگار بە مەرجی گرتووە کە ئەو ئادەمیزادە خۆی چاك بکات، وەك پێمان دەفەرمووێ: ﴿ أَنَّهُۥ مَنْ عَمِلَ مِنكُمْ سُوٓءًۢا بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥٤﴾ ﴾ الأنعام،واتە: (ئەوانەی تەوبە دەکەن، دوای تەوبەکانیشیان چاك دەبن، ئەوانە بە دڵنیاییەوە خوای گەورە بەبەزەیی و

---

(١) - تفسیری ڕێبەر

(٢) - تەفسیری ئاسان

لێخۆشبووە لەگەڵیان.)[١]

بەڕێزان! کە خوای گەورە ئەوەندە بەبەزەییە لەگەڵ ئێمە، با ئێمەش بەبەزەیی بین لەگەڵ خۆمان، گوناهکردن بۆ دڵ و دەروون وەك نەخۆشی وایە بۆ جەستە، ئەگەر زوو چارەسەر نەکرێت، ئەو دڵە دەمرێنێ؛ ئەگەر زوو ڕێ لەو نەخۆشییە نەگیرێ، ئەوا بڵاو دەبێتەوە و تەشەنە دەکات. لە ئەنجامدا چارەسەری ئەستەم دەبێت.

**تەوبەکردن پێویستی بە بەردەوامی و جێگیربوون هەیە:**

خوای گەورە بە پێغەمبەر (ﷺ) و باوەڕداران دەفەرمووێ: ﴿ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ ﴿١١٢﴾ ﴾ هود، واتە: (بەردەوام و دامەزراو بە وەك چۆن فەرمانت پێ کراوە و، لەگەڵ ئەو باوەڕدارانەش کە لەگەڵتدان.)[٢]

دوای تەوبەکردن، بەردەوامی و کردەوەی چاك پێویستە، وەك خوا (عــز وجــل) دەفەرمووێ: ﴿ وَإِنِّى لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ ﴿٨٢﴾ ﴾ طه، واتە: (من زۆر لێخۆشبوو و داپۆشەری گوناهم بۆ ئەو کەسەی کە تەوبە دەکات و کردەوەی چاك دەکات و، پاشان ڕێنمایی وەردەگرێ و، ڕێنموویی دەکەم)[٣]

حەیف و مخابن بۆ ئێمەی موسڵمان خوای مەزن بەو هەموو

---

(١) - پوختەی تەفسیر

(٢) - تەفسیری ڕێبەر

(٣) - تەفسیری ئاسان

بەزەییەی خۆی چاوەڕێی یەك هەنگاوی ئێمەیە! کەچی ئێمە سستی و خاوەخاوە دەکەین. خۆ ئەگەر یەك هەنگاو بهاوێین، خوای گەورە چەند هەنگاوێك لێمان نزیك دەبێتەوە.

### چارەنووسی ئەوانەی کە تەوبە ناکەن:

خوای بالادەست دەفەرمووێ: ﴿ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿١١﴾ ﴾ الحجرات، واتە: (ئەوانەی تەوبە ناکەن، ئەوانە لە ستەمکارانن.)[1] هەر کەسێ نەگەڕێتەوە، ئەوە خوای گەورە بە ستەمکار لە قەڵەمی دەدات. بۆچی خوای گەورە بە ستەمکار ناوی بردووە؟

لەبەر ئەوەی تەوبە ناکەیت و ناگەڕێیتەوە لای خوای گەورە، بەمەش ستەمێکی زۆر گەورەت لە خۆت کردووە. دیارە کە خوای گەورە دەرفەتی زۆر بە ئادەمیزاد دەدات. لە ماوەی ژیانتدا، چەند لافیتەی ڕەشت بینی و چەندەها کەس لە خزمان و نزیکانی خۆت وەفاتیان کرد. لەگەڵ تۆ نانیان دەخوارد و پیاسەیان دەکرد و هەڵدەستان و دادەنیشتن، بیر بکەوە چەند کەس تاکوو ئێستا لە دەوروبەری تۆ مردوون؟! هەڵبەتە بۆیە خوای گەورە بە ستەمکار ئەو کەسانەی لە قەڵەم داوە کە تەوبە ناکەن، چونکە ئەو هەموو دەرفەتە بەسەریاندا تێ دەپەڕێ، کەچی دەرس و پەند و عیبرەت

---

(١) - تەفسیری ڕامان

وەرناگرن.

دوا جار بزانە تۆ لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدا دەبێ یەکێکیان هەڵبژێری، ئەوە چارەنووسی ئادەمیزادە، تا دەرفەتی ژیانت لەپێشە، خۆت لە ئاگر ڕزگار بکە و خۆشەویستیی خوای گەورە و بەهەشت بە دەست بێنە. ئەمەش چۆن دەبێ؟ هەنگاوی یەکەم وەك باسمان کرد، تەوبەکردن و گەڕانەوەیە بۆ لای خوای دادگەر، ئینجا ئەنجامدانی کردەوە چاکەکان و، ئیتر بەردەوامبوون لەسەر خۆپاراستن لە گوناهـ و تاوان و، کردنی کردوەی چاکی زۆر.

جا بۆچی تۆ لەو کەسانە نەبی کە پەڕاوی کردوەکانیان بە دەستی ڕاست وەردەگرن، ئیتر ڕاستەوخۆ دەچن بۆ بەهەشت و هەق و حسابێکی سووك و ئاسانیان لەگەڵدا دەکرێ؟!

# چەند ڕووداوێکی ڕاستەقینە دەربارەی بالاپۆشی

**ڕووداوی یەکەم:**

ئافرەتێکی مردووشۆر کە بە دایکی ئەحمەد ناسراو بوو، خەڵکی شاری ڕیازی پایتەختی وڵاتی سعوودیە بووە. ئەم ئافرەتە دەڵێ: من ساڵانێکی زۆر بوو خۆم تەرخان کردبوو بۆ شووشتنی ئەو ئافرەتانەی کە کۆچی دوایی دەکەن. ڕۆژێکیان چەند ئافرەتێك لەگەڵ شۆفێرێك لە دەرگای ماڵەکەمیان دا و گوتیان: کچێکی گەنجمان کۆچی دوایی کردوە و هاتووین بۆ ئەوەی لەگەڵمان بێیت و بۆ شووشتن و کفنکردنی کچەکەمان. ئیتر منیش گوتم بەسەرچاو. خۆم ئامادە کرد و لەگەڵیان کەوتمە ڕێ. کە گەیشتینە شوێنی مەبەست، منیان برد بۆ گەرماوی ماڵەکەیان کە لاشەی کچە مردووەکەیانی لێ بوو. ئیتر لە ناکاو دەرگای ئەو گەرماوەیان لەسەر من داخست، منیان لەگەڵ کچە گەنجەکەیان بەند کرد و دەرگایان لەسەر داخستم. ئیتر من زۆر ترسام و ڕاچڵەکیم، دەم و چاوی کچەکەم هەڵدایەوە و سەیرم کرد بینیم ڕوخساری ڕەش هەڵگەڕابوو. سەیرێکی جەستەیم کرد، بینیم جەستەشی بۆنێکی بۆگەنی لێ دەهات، ئیتر زیاتر ترسام، بۆیە دەستم کرد بە هاوار و لێدانی دەرگا، بەڵام بێئەنجام بوو و هیچ کەسێك وەڵامی

نەدەدامەوە، ناچار بووم دەستم کرد بە شۆردنی کچەکە و پاشان وشکم کردەوە و کفنیشی بۆ ئامادە کرابوو، ئیتر کفنیشم کرد. جارێك یتر دەستم کردەوە بە هاوارکردن و لێدانی دەرگا و گوتم ئەوە ئەو ئەرکەی بە منتان سپاردبوو لە شۆردن و کفنکردنی کچەکەتان، بە جێم گەیاند. تکا دەکەم دەرگاکە بکەنەوە. ئیتر ئەم جارە کە ئەو گوتانەی منیان بیست، بە دەنگ هاوارکردنەکەمەوە هاتن و دەرگاکەیان کردەوە. منیش ئەوەندە پەشۆکاو بووم، خێرا ڕامکرد و گەڕامەوە ماڵەوە و زۆر بیرم دەکردەوە ئەرێ دەبێ ئەم کچە چ گوناهـ و تاوانێکی کردبێ تا حاڵی ئەوەندە خراپ بێت؟! بۆ دەستکەوتنی وەڵامی ئەم پرسیارە کە هەموو هەست و ژیری و بیرکردنەوەی داگیر کردبووم، دوای (٣) ڕۆژ بۆ وەرگرتنی وەڵامی ئەم پرسیارە سەردانی ماڵی ئەو کچە گەنجەم کردەوە. دوای گفتوگۆ و گلەیی لە شێوازی مامەڵەکردنیان لەگەڵ من و بەندکردنم بە تەنیا لە گەرماوەکە لەگەڵ کچە مردووەکەیان، لە وەڵامدا بە داوای لێبوردنەوە گوتیان: ناچار بووین وا بکەین، ڕێچارەیەکی دیکەمان نەبوو، چونکە پێش تۆ (٧) ئافرەتی ترمان هێنابوو بۆ شووشتنی کچەکەمان، بەڵام هەر حەوتیان بەرگەیان نەگرت و بە پەشۆکاوی ڕایان دەکرد. بۆیە ناچار بووین دەرگا لەسەر تۆ دابخەین بۆ ئەوەی تۆش وەك مردووشۆرەکانی تر بە ترس و پەشۆکاوی ڕا نەکەی. گوتم دەی دەکرێ بزانم کچەکەی ئێوە چ گوناهـ و تاوانێکی کردبوو تا ڕوخساری ئاوا ڕەش هەڵگەڕێ و جەستەشی بۆگەن بکات؟ گوتیان: بە داخ و پەژارەیەکی زۆرەوە کچەکەمان لە نوێژکردندا

سست و کەمتەرخەم بوو، سەرەڕای ئەوەش حەزی لە خۆجوانکردن و خۆدەرخستن بوو، ئامادە نەبوو ملکەچی فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەری خوا بێت (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و وەك ئافرەتێکی بڕوادار بالاپۆشی بکات.

## ڕووداوی دووەم

پیاوێکی بڕوادار دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: کچێکم هەبوو تەمەنی (٢٠) ساڵان بوو. ئەم کچەم زۆر دیندار و لەخواترس بوو. زۆربەی کاتەکان خەریکی خوێندنی قورئان و عیبادەت بوو. پێداگر بوو لە کردنی شەونوێژەکانی و بالاپۆشێکی ڕێکوپێك بوو. زۆر جار من و دایکی پێمان دەگوت: کچم پشوویەك بدە، تۆ زۆر هیلاکی بە خوێندنی قورئان و خواپەرستی، بەڵام ئەو دەیگوت: نا، خۆشیی من لە خواپەرستی و شەونوێژ و قورئانخوێندندایە. ئیتر ڕۆژێك گشتمان دەرچووین بۆ سەردانی هەندێك خزم و ناسیاومان، هەر لە سەرەتای دەرچوونمانەوە، ئەو کچەم خەریکی خوێندنی قورئان بوو، ئیتر لە نیوەی ڕێگادا تووشی ڕووداوی هاتووچۆ بووین، لە ئەنجامدا گشتمان بە سەلامەتی دەرچووین، تەنیا کچە دیندارەکەم نەبێ کە زۆر بە سەختی بریندار بوو، بەڵام ئەو هەر قورئانەکەی توند بە دەستەکانیەوە گرتبوو تا دواهەناسەکانی و هەڵفڕینی گیانی پاکی. بەڵێ ئەمەیە سوننەت و بەڵێنی پەروەردگار، لە ژیاندا بە چییەوە سەرقاڵ بی، ژیانیشت هەر بەوە کۆتایی دێت.

## ڕووداوی سێیەم

شێخ خالید ڕاشد دەفەرمووێت: پزیشکێکی پسپۆڕی ئافرەتی باڵاپۆش و لەخواترس و پاك، گەشتێکی کرد بۆ ئەورووپا بە ئامانجی بەشداریکردن لە کۆنفرانسێکی زانستیی پزیشکی. لە کاتێکدا ئەو ڕووبەند (نیقاب)ـی دەپۆشی، کۆمەڵێك ئافرەتی سفووری مەسیحی ڕوویان لەم ئافرەتە پاکە کرد و تانە و تەشەریان لێ دەدا و پێیان دەگوت: داخوا خاوەن چ ڕوخسار و قژێکی ناشیرینە بۆیە ئەم ڕووبەندەی پۆشیوە؟! ئیتر ئەم ئافرەتە لەخواترسە زۆر ئارام بوو و چاوەڕوانی دەرفەتێکی دەکرد بۆ وەڵامدانەوەیەکی جوان و پڕ لە حیکمەت. ئیتر لە کاتی پشوودانداا بە دەرفەتی زانی و بانگی ئەم ئافرەتانەی کرد، لە ژوورێکی تایبەت بە ئافرەتان ڕووبەندەکەی دانا و ئافرەتە مەسیحییەکان بینییان ئافرەتێکی زۆر جوان و شۆخ و شەنگە، سەریان سوڕما و ئەم جارە گوتیان: تۆ ئازاد نیت، ئەم ڕووبەندە هاوسەرەکەت بە سەریدا سەپاندووی و فەرمانی ئەو جێبەجێ دەکەی. ئەویش گوتی: سوێند بە خوا پۆشینی ئەم ڕووبەندە تەنیا ملکەچیی منە بۆ فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەری خوا. ئەگەر لەبەر خاتری ڕەزامەندیی پەروەردگار نەبووایە، هەرگیز ئامادە نەبووم فەرمانی هیچ کەسێکی ترم جێبەجی کردبا. ئیتر بە شێوازێکی ئەوەندە جوان و پڕ لە حیکمەت گفتوگۆی

لەگەڵ کردن، هەر لەم کۆڕبەندە حەوت ئافرەتی کرد بە موسڵمان.

## ڕووداوی چوارەم

پیاوێك دەگێڕێتەوە و دەڵێ: کچێکم هەبوو زۆرم خۆش دەویست، بەڵام قەدەری خوا وا بوو نەخۆشیی تاعوون لە شارەکەمان بڵاو بوویەوە، ئیتر کچەکەی منیش یەکێك بوو لە تووشبووانی ئەم ڤایرۆسە و، دواجار بووە هۆی گیانلەدەستدانی. ئیتر بە مردنی ئەو زۆر غەمبار و بێتاقەت بووم، هیواخواز بووم شەوێك لە خەو ببینم. خوای گەورە ئاواتەکەمی هێنایە دی و لە خەودا بینیم و لێم پرسی: کچە جوانەکەم، گیانکێشان و مردن چۆنە؟ بۆم باس بکە.گوتی: باوکە گیان! گیانکێشان و مردن زۆر سەختە و خۆئامادەکردنی دەوێ، ئینجا ڕستەیەکی زۆر بەهێزی پێ گوتم کە هەرگیز لە یادی ناکەم، گوتی: (کنا نعلم ولا نعمل)، واتە: ئێمە دەمانزانی، بەڵام کارمان پێی نەدەکرد.

## ڕووداوی پێنجەم

ئافرەتێکی سعوودی دڵێ: سەردانی کۆمەڵێك خزم و کەسمان کرد کە لە شارێکی دیکە بوون. چەند ڕۆژێك لە لایان ماینەوە، زۆر دڵخۆش بووین لەگەڵیان. ئەو ڕۆژەی کە بڕیار بوو بگەڕێینەوە بۆ شارەکەی خۆمان، پورم نیوەڕۆخوانێکی بۆ ڕێک خستین. منیش پێش دەرچوون، ویستم لە تەواوی پۆشینی باڵاپۆشی و لەچەکەکەم دڵنیا ببمەوە، سەیری ئاوێنەم کرد، هەستم کرد کە دووپشکێکی ناسروشتی بەسەر سەرمەوەیە، بە پەلە گرتم و دام بە زەویدا و هاوارم لێ بەرز بوویەوە، گوتم: ئەمە چی بوو؟ لە کوێ هات؟ شتی وام نەبینبوو. دوای کوشتنی دووپشکەکە، تۆزێك ئارام بوومەوە، زۆر سپاسی خوای گەورەم کرد، زانیم ئەو منی پاراستووە، بە هۆی ئەو لەچەکەی کە بە فەرمانی ئەو لەسەرم کردبوو.

## ڕووداوی شەشەم

کچێك باسی ژیانی خۆی دەکات و دەڵێت:

زۆر ڕقم لە ژیانی خۆم دەبێتەوە، بە هۆی هەڵەیێکی گەورە کە لە ڕابردووم کردم و بە هۆی خۆشەویستییەکی درۆیینە!

من کچێکی شۆخ و شەنگ بووم و هەرگیز حەزم بە باڵاپۆشی نەبووە و هەمیشە هەوڵم دەدا لە هەمبەر گەنجان بە جوانترین شێوە دەربکەوم. ئیتر لە یەکەم ساڵی چوونم بۆ کۆلێج کوڕێکم ناسی کە گەنجێکی زۆر جوان بوو و پێی سەرسام بووم و ئەویش بە جوانی و شۆخ و شەنگییەکەم سەرسام بووبوو. ئیتر بە بەردەوامی قسەمان لەگەڵ یەکتر دەکرد و هەتا دەرچوونیشمان پێکەوە هەبوو، تا پەیوەندییەکەمان زۆر قووڵ بوو و وای لێهات من دەچووم بۆ ماڵیان و بە تەنیا دادەنیشتین. ئەویش کەسێکی زۆر قسەزان و زمانلووس و فریودەرب وو و قەناعەتی پێ هێنام و ڕازیی کردم کە ئێمە یەکمان خۆش دەوەێ و بە یەکتر ڕازین، ئیتر هاوسەرگرییش بریتییە لە ڕەزامەندیی هەردوو لا. بۆیە منیش خۆم بە دەستەوە دا و تەسلیمی بووم. دوای ئەوە، چەندان جار ئەو کارە ناشەرعییە دووبارە بووەوە، ئەویش بە شێوەیەکی زۆر خۆپەرستانە مامەڵەی لەگەڵم دەکرد، هەرچەند پێم دەگوت کە بێتە خوازبێنیم و هاوسەرگری بکەین، بەڵام هەموو جارێك بە بەهانەیەك بابەتەکەی دوا دەخست. وای لێ هات کە دەچووم بۆ ماڵیان، لەگەڵ کچی تر هەمان کاری دەکرد. کاتێك

# ناوەڕۆك

# باڵاپۆشی

تاج و ناسنامەیەکی پڕ لە شکۆمەندیە
بـۆ ئافرەتانی بڕوادار

باڵا پۆشی بڕوایە، ملکەچیە، خوا پەرستییە، لە خوا ترسیە، تاجە، پاکیە، سترە، شەرم و شکۆیە، ناسنامەیە، غیرەتە، وە ئافرەتی باڵاپۆش بە خواپەرست و ڕۆژوو گر (الصّوامة والقوّامة) هەژمار دەکرێ، کە پاداشتەکەی بریتیە لە بەهەشتی نەبڕاوە، باڵانەپۆشی بریتیە لە سەرکەشی و بێ فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی (درودی خوای لێ بێ) بە درێژایی کات و ساتەکان سزاکەی بریتە لە دۆزخ، لە کۆتایی نامیلکەکە چەند ڕووداوێکی ڕاستەقینە باسکراوە، لەگەڵ چەند موژدەیەکی خۆش لە فەرموودەکانی پێغەمبەری (درودی خوای لێ بێ).

بە هیوام ئەم نامیلکە بگات بە دەست سەرجەم ئەو خوشکانەی کە پێوستیان بە ڕێنمایی کردنە بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی باڵا پۆشیە.

کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی

لقی یەکەم: بەرانبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری
لقی دووەم: چوارڕیانی شێخ مەحموود - بەرانبەر مزگەوتی مەحموود عەللاف

٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤ M.Ktebxan نرخ: ٣٠٠٠